حکومەتا هەرێما کوردستانێ – عیراق

وەزارەتا پەروەردێ

رێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# پەروەردەیا وەرزشـــــی

## بۆ پۆلا دەهێ ئامادەیی

**لیژنەیا ئامادەکرنێ**

دلێر خضر صالح | شهاب احمد امین | صدیق اسماعیل باپیر

رزگار مجید صالح | زیاد بکر فقی عمر

**هاتییە کرمانجیکرن ژلایێ**

جمال طیب عبدالرحمن | بهزاد غفار حفظ الله | سفر محمد محمد

نهاد ابراهیم رشید | سمیر محمد علی | حکیم حسین یوسف

محمد نبي صالح

**پێداچوونا زمانی**

محمد عبدالله أحمد

**پێداچوونا زانستی**

سمیر عبدالعزیز حجي

چاپا سێیێ | ٢٧١٥ کوردی | ٢٠١٥ زایینی | ١٤٣٦ مشەختی

# بناڤێ خودێ مەزن و دلوڤان

## ( پێشەکی )

**قوتابی و خوێندکارێن خوشتڤی .....................................................**

ئەڤ بەرهەمێ کوهاتیە بەرهەڤکرن ژ لایێ سەرپەرشتیارێت وەرزشی دیاریە بوهەوەیێن بەرێز کو کاری لسەر بکەن وببیتە بەرنامێ ڤێ قوناغێ کو ڤالاییەك هەبو لڤی بواری پێخەمەت پێشڤچونا یارێت رێکخستن ڤێجا چ لرویێ تەکنیك و تەنیکێ بیت یان لرویێ یاسایا بیت وە بئەگەرێ پێشڤەچوونا بەردەوام یا یاریا تەپا سەلکێ و تەپا ڤولی بولێ و لەزاتیا بەرەڤ پێشڤەچونێ مە بباشی زانی کو ئەم بوڤێ قوناغێ ڤی بابەتی دانینە بەردەستێت هەوە بو گەهاندنێ بۆ قوتابیا و ڕوونکرنا یاسایێت هەردو یاریا تەپا سەلکێ و تەپاتورێ .کو پێشکەفتنا بەرچاڤ یا هەی لجیهانێ و گەهشتیە کو پێکا هەرەمێ ژیارکرنێ و رێڤەبرنێ ژ لایێ دادڤانێت خودان شیان .بابەتێت ڤێ پەرتوکێ نوێرین گوهورین و زانیارێت نیف دەولەتی کو کارێ پێدکەن . لەوما پیتەدان ب وەرزشێ قوتابخانا ئەرکەکێ پیروزە کو ماموستایێ وەرزشی هەول بدەت دناڤ قوتابخانێ دا و پشکدارێ دچالاکیادا و پەیرەو کرنا یاسایێت ڤێ یارێ و شروڤەکرنا وێ ئەم ژی بێ بەهر نابینی ژڤێ پێشکەڤتنێ و ئارمانجێن وەزارەتا پەروەردێ و بەرهەڤکرێت ڤی بەرهەمی پێشکەفتنا وەرزشێ ل قوتابخانا و گەهاندنا وێ بئاستێ و لاتێت پێشکەفتی دڤی چەرخێ نوی دا کوو وەرزش بویە ئامیرەکێ بهێزێ پەیوەندیا دناڤبەرا گەلان و بجهئینان و پویتێدانا زێدەتر دبیتە ئەگەرا تێرکرنا حەزو ڤیانا قوتابیان و خویندکارا لڤی بابەتێ گرنگ و ئەگەرێ سەرەکی یێ پێشکەڤتنا وەرزشی ل قوتابخانا. ل دوماهیێ زور سوپاسیا هەمی وان بەرێزان دکەین کو هەول دای و وەستیاین بو بەرهەڤ کرنا ڤێ پەرتوکێ ب تایبەتی وەزارەتا پەروەردێ کو زەمین خوشکری بو هەمی کەسا و پشتەڤانیا بەردەوام نیشادایە ل پێخەمەت بەرەڤ پێشڤەچونا پەروەردا وەرزشی ل هەرێما کوردستانێ .

# بـــەشـــێ ئـــێكێ
# كورتیەك ژ یاسایا باسكت بۆلێ




لیژنا ئامادەكرنێ

دلێر خضر صالح
سەرپەرشتیارێ پسپۆرێ وەرزشی

رزگار مجید صالح
سەرپەرشتیارێ پسپۆرێ وەرزشی

زیاد بكر فقی عمر
سەرپەرشتیارێ پسپۆرێ وەرزشی

# یاسایا باسکت بولیّ

## بەندیّ -١- پیّناسە :

یاریا باسکت بولیّ دناڤ بەرا دوو تیمان دا دهیّتەکرن هەر ئیّك ژ پیّنج یاریکەران پیّك دهیّت ، ئارمانجا هەر تیمەکیّ تۆمارکرنا خالایە ، ونەهیّلیت تیما دی خالان تۆمارکەت .

### (١-١) سەلك : Basket

ئەو سەلکا هیّرش لسەر دهیّتەکرن ژ لاییّ تیمەکیّ ڤە ئەو سەلکا هەڤرکایە و ئەو سەلکا بەرەڤانی ژیّ دهیّتەکرن ئەو سەلکا تایبەتە بویّ تیمیّ ڤە .

**(١-٢) ییّ سەرکەفتی دیاریێ دا :** ئەو تیما پتر خالان تۆمارکەت تاکو دوماهیا یاریێ ئەو یا سەرکەفتی یە د یاریێ دا.

## بەندیّ -٢- یاریگەهـ :

دڤێت یاریگەهـ لاکیّشە بیت ویا ڤالا بیت ژ ئاستەنگان ودیارییّن دەولەتی دا دڤێت دریّژاهیا یاریگەهیّ (٢٨ م) بیت وفرەهی (١٥م) بیت ژلێڤا ژناڤدا یاخیچا سنوری بهیّتە پیڤان ، و ئیّکەتیّن وەلاتان دەستهەلات یاهەی پشت بەستنیّ بکەن ب مەیدانیّن دریّژاهیا وان ژ (٢٦ م) کیّمتر نەبیت وپاناتی ژ (١٤م) کیّمتر نەبیت (ویّنە ژمارە ١).

### (٢-١) خیچ : Lines

دڤێت خیچ بهەمان رەنگ بهیّنە نیگارکرن ب ڕەنگیّ سپی پاناتی (٥ سم) و باشی دیارکەن.

### (٢-٢) خیچیّن ڕەخان ودوماهییّ : Boundare line

پیّدڤیە مەیدانا یاریێ بهیّتە دیارکرن (بدوو ٢) خیچیّن دوماهییّ وخیچیّن رەخان ، وئەڤ خیچە بەشەك نینن ژ مەیدانا یاریێ و دڤێت مەیدانا یاریێ یا دویر بیت (٢ متران) ژهەر ئاستەنگەکی بکیّماسی وژوانا جهیّن روونشتنا تیمان .

### (٢-٣) خیچا سەنتەری : (خط المركز) Line Center

خیچا سەنتەری : ئەو خیچا نیگارکریە (تەریب) دگەل خیچیّن دوماهییّ کو ژهەردوو خالیّن نیڤیّ ییّن خیچیّن رەخان بدریژاهیا (١٥ سم) ژ دەرڤەی هەر خیچەکا رەخان .

### (٢-٤) بازنیّ ناڤەند : (الدائرة المركزية) Ceneter Circle

بازنیّ نیڤیّ دهیّتە نیگارکرن لنیڤا مەیدانیّ بنیف تیرە (١٨٠)سم یا پیڤایی ژلێڤا ژدەرڤە یا چیّویّ بازنیّن دی ییّن ناڤ مەیدانیّ کو دهیّنە نیگارکرن دمەیدانا یاریکرنیّدا بنیف تیرە (١٨٠)سم دهیّتە پیڤان ژلێڤا ژدەرڤە یا چیّویّ بازنیّ وسەنتەریّ وان لسەر خالا نیڤا خیچین شوتکرنیّن ئازاد . (ویّنەییّ ژمارە ١)




**وێنەی ژمارە ( ١ )**

**یاریگەها باسکت بولێ**

## ( ٢-٥ ) خیچێن شوتکرنێن ئازاد و دەڤەرێن قەدەغەکری :

پێدڤیە خیچا شوتکرنا ئازاد بهێتە نیگارکرن تەریب لگەل هەر ئێك ژخیچا دوماهیێ وپێدڤیە لێڤا وێ یادویر ژ لێڤا ژناڤدا یا خیچا دوماهیێ دویرکەڤیت ب (٥،٨ م) ، دەڤەرێن قەدەغەکری ئەو روبەرێن ئەردینە یێن کو دسنوردای ودۆرپێچ کرینە ژ مەیدانێ دناڤ بەرا خیچێن دووماهیێ ، خیچین شوتکرنا ئازاد ، وئەو خیچێن دەست پێ دکەن ژخیچێن دوماهیێ ، ولێڤا وێ یاژدەرڤە یادویرە ژخالا نیڤێ یاخیچێن دوماهیێ ٢،٤٥ ژ هەر رەخەکی (وێنە ژمارە ٢)

## ( ٢-٦ ) دەڤەرا گۆلکرنێ یا بسێ خالان :

دەڤەرا گۆلکرنێ یا بسێ خالان یا تیمێ ئەو هەمی روبەرێ ئەردێ دەڤەرا مەیدانا یاریێ یە ژبلی دەڤەرا نێزیك ژسەلکا هەڤرکی ویا سنوردایە وپێك دهێت ژ :

- دو خیچێن تەریب کو ژهێلا دووماهیێ درێژبووینە (٠،٧٥) م دوورن ژ هێلیت تەنشتێ رەخا .
- نیڤ بازنە یەك کو ژ ٦،٧٥م ژ لێڤا ژدەرڤە بۆ سەنتەرێ ژخالا ستوینی ئەوا ئێکسەر دکەڤیتە ئەردی ژ سەلکا هەڤرکان هاتیە پیڤان ، ودرێژی ژ وێ خالێ تاکو لێڤا ژناڤدا ژخالا نیڤێ یا خیچا دوماهیێ ١،٥٧٥ م ئەو دگەهتە خیچێن تەریب . (وێنە ١)




وێنەێ ژمارە ( ٢ )
نیڤ بازنە وسەنتەرێ وان ودەڤەرا قەدەغەکری دا
( الرمية الحرة )




وێنەی ژمارە (٣)

## بەندێ -٣- کەل و پەل Equipment:

پێدڤی یە لدەمێ ئەنجامدانا یاریا باسکت بۆلێ ئەڤ کەل وپەلێن تایبەت بیاریێ ڤە بهێنە دابینکرن :-

١. یەکەیێن راوەستاندنا پشتێ پێك دهێن ژ :

- هەردوو بۆرد (لوحة)
- هەردو سەلك پێکهاتی بن ژدوو خەلەکێن نەرم ودوو تۆران.

٢. تەپا باسکت بۆلێ .

٣. دەمژمێرا یاریکرنێ.

٤. بۆردێ ئەلکترۆنی یێ تۆمارکرنێ (لوحة تسجیل)

٥. ئاميرێ (٢٤) چركان .

٦. دەمژمێرا راوەستاندنێ یان ئاميرەكێ بەرچاڤ ژبلی دەمژمێرا ياريكرنێ بۆ هژمارتنا دەمێ ڤەبڕی.

٧. دوو ئاميرێن دەنگی یێن بهێز ژلایێ دەنگی ڤە جوداهی هەبيت .

٨. فورما تۆماركرنێ .

٩. نيشانێن فاولێن ياريكەران .

١٠. نيشانێن فاولێن تيمێ .

١١. ئيشارەت بدەست خستنا ئال وگوريێ (الحيازة المتبادلة) .

١٢. روناهيەكا گونجای .

١٣. مەيدانا ياريێ .

## بەندێ -٤- تيم Teams:

### ( ٤-١ ) پێناسە :

تيم پێك دهێت ژوان ياريكەران ويەدەك وئەندامێن تيمێ ئەوێن ناڤێن وان دليستا تيمێ دا .

### ( ٤-٢ ) تيمەك پێك دهێت ژ :

١. ژ (١٢) ياريزانان كو ئێك ژوان كابتنە.

٢. ڕاهێنەر، هاريكارێ ڕاهێنەری ئەگەر تيم پێدڤی بيت .

٣. پێنج ژلايەنگەرێن تيمێ ل جهێ يەدەكێن تيمێ نە وكارێن تايبەتێن خۆ هەنە وەك (رێڤەبەر ، نوژدار ، چارەسەركەری سروشتی ، ئاماركار ، وەرگێر ....).

٤. ( ٤-٣ ) :

پێدڤيە پێنج ياريكەر بۆ ياريكرنێ دناڤ ياريگەهێ دا ل دەست پێكا ياريێ دا ئامادەبن ودشياندایە بهێنە گوهۆڕين ددەمێ ياريێ دا ل دويف ياسايێ .

### ( ٤-٤ ) جل وبەرگێن ياريكەران: Uniforms

جل وبەرگێن ياريكەران پێك دهێن ژ :

١. تيشێرت ئێك ڕەنگ بيت ژبەر وپشت ڤە ، وپێدڤيە كور وكچ تيشێرتێن وان دناڤ شۆرتی دا بن ددەمێ ياريێ دا .

٢. پێدڤيە شۆرت ئێك رەنگ بيت ژسينگ وپشتان ڤە ، وج نينە ژهەمان رەنگێ تيشێرتی بيت .

٣. نابيت تيشێرتێ (بێ هچك) دبن تيشێرتێ ياريێ دا بهێتە لبەركرن، بتنێ ب ڕەزامەنديا نوژداری .

## ( ٤-٥ ) پێدڤیە ژمارە دئاشکەرابن  لسەر تیشێرتان بڤی رەنگێ لخوارێ:

١. ژمارا پشتا تیشێرتی ژ (٢٠ سم) کێمتر نەبیت .

٢. ژمارا پێشیێ (سینگی) یا تیشێرتی ژ ١٠ سم کێمتر نەبیت .

٣. پاناتیا ژمارەی ژ (٢سم) کێمتر نەبیت.

٤. دڤێت ژمارێن یاریکەران ژ (٤ -١٥) بن بەلێ هەر تیمەك دشێت (٢) ژمارێن دی بدانیت بمەرجەکی دناڤبەرا (١٦-٩٩) بن .

٥. چ یاریکەر نەشێن هەمان ژمارا یاریکەرەکێ دی بکاربینیت دهەمان یاریێدا .

٦. ئەگەر هەر ریکلامەك هەبیت لسەر تیشێرتی پێدڤیە (٥ سم) یا دوربیت ژ ژمارێ .




وێنەیێ ژمارە (٤)

## ( ٤-٦ ) ئەو کەل وپەلێن نەدەستیردای بو یاریزانی:

١. پارێزین تبلا ، دەستی ، گەها دەستی ، مل ، ئەنیشك ئەڤە هەمی رێ پێ نەدایە بمەرجەکی هاتبنە دروست کرن ژ (ئاسن - پیستی - پلاستیکی) وهەر کەرستەکێ دی ئەگەر بتشتەکێ نەرمژی بهێتە داپوشین.

٢. ئەو کەرستێن دبنە ئەگەرێ برینداركرنێ ، ودڤێت نینوکێت تلا ژی بهێنە کورت کرن.

٣. -کەل وپەلێن سەری وجوانکاری .

## ( ٤-٧ ) ئەو کەل وپەلێن دەستیردای بۆ یاریکەری:

١. کەل وپەلێن پاراستنا (مل ، ران ، ئەنیشك ) بنێ لنگی ئەو ژی ئەگەر ئەو تشت یێ داپوشاییبیت  بشێوەیەکی نەبیتە ئەگەرێ بریندداربونا یاریکەرێ بەرامبەر.

٢. - پشت بەستنێن چوکی ئەگەر بشێوەکێ باش یێ داپوشاییبیت .

٣. پارێزێن دفنا شکەستی ئەگەر بهێتە دروست کرنژی ژ ماددەکێ رەق .

٤. بەرچاڤك ئەگەر نەبیتە مەترسی لسەر یاریکەرێن دی .

٥. بالولکێن سەری بپاناتی پتر نەبیت ژ (٥ سم) وژپەروکی دروست  کربیت یان ژ ماددەکی بیت  نەبیتە ئەگەرێ برینداركرنا یاریکەران .

## بەندێ -٥- ياريكەر - هنگافتن: Players Injury

( ٥-١ ) ل دەمێ ياريكەر دهێتە هنگافتن ، دادڤان دشێت يارييێ راگريت .

( ٥-٢ ) ئەگەر تەپە يا بلڤين بيت وياريكەر توشى هنگافتنێ بوو پێدڤيە دادڤان ياريكرنێ نەراگريت تاكو هێرش بدوماهيى دهێت ، ئەگەر هەمان تيم كونترۆلێ لسەر تەپێ بكەت ، ولدەمێ شوتكرنێ بۆ گۆلێ خوين بەربون چيبوو يارى دێ هێنە راوەستاندن ئەگەر تەپە ل لايێ كيش تيمێ بيت .

( ٥-٣ ) پشتى يارىى هاتيە راوەستاندن دڤێت (١٥ چركان ) چاڤەرێ ياريكەرى بكەين پاشى دڤێت بهێتە گوهارتن و بچيتە ژدەرڤەى ياريگەهێ .

( ٥-٤ ) نوژدار دشێت بچيتە ناڤ ياريگەهێ بێى رازيبوونا دادڤانى ئەگەر زانى ياريكەر پێدڤى چارەسەرييێ يە ، لدەمێ نوژدار هاتە ناڤ ياريگەهێ دڤێت ئەو ياريزان بهێتە گوهۆڕين .

( ٥-٥ ) ئەگەر ياريكەرەكى بۆ شوتكرنێت ئازاد هاتنە هژمارتن وژئەگەرێ هنگافتنێ نەشيا بجهـ بينيت ، ياريكەرێ يەدەك جهێ وى گرت دێ وان شوتكرنان بجهـ ئينيت .

( ٥-٦ ) ئەگەر ياريكەرەك بريندار بوو يان خوين هاتە ديتن پێدڤيە بچيتە ژدەرڤەى ياريگەهێ تاكو چارەسەرى بۆ دهێتە كرن وپاش چارەسەرييێ دشێت بهێتە دناڤ ياريگەهێ دا .

( ٥-٧ ) دشێانداية ياريكەرى بگوهۆرى ئەگەر ياريكەر يێ ئامادە بيت بۆ گوهۆڕينێ بەرى توشى هنگافتنێ ببيت وتيما بەرامبەر ژى دشێت گوهۆڕينا بكەت ئەگەر ڤيا .

## بەندێ -٦- كاپتن ، ئەرك ودەستهەلاتێن دى :

( ٦-١ ) كاپتن ئەو ياريكەرێ نوينەرێ ياريكەرێن ديە دناڤ ياريگەهێ دا دشێت پەيوەنديێ بدادڤانى بكەت ددەمێ يارييێ داكو زانياريا بدەنێ ل دەمێ راوەستانا يارييێ ودەمژمێرا يارييێ يا راوەستاى بيت.

( ٦-٢ ) كابتن دشێت كارێ راهێنەرى بكەت ئەگەر نەبيت يان هاتبيتە دەرئێخستن .

( ٦-٣ ) كابتن دشێت ل دوماهيا يارييێ نەرازيبونێ دياربكەت ل تيما بەرامبەر بمەرجەكى ئيمزايێ لسەر فۆرما يارييێ بكەت .

## بەندێ -٧-راهێنەرا

### ئەرك ودەست هەلاتێن وى:

( ٧-١ ) پێدڤيە لسەر راهێنەرى يان ئەو كەسێ رادبيت بكارێ راهێنەرييێ ب ئامادەكرنا ليستەكێ بناڤێ هەمى ياريكەران وژمارێن وان وكابتنێ تيمێ وراهێنەرى و هاريكارێ راهێنەرى (٢٠) خولەكا بەرى دەستپێكرنا يارييێ پێشكێش تۆماركەرێ يارێ بكەت.

( ٧-٢ ) بەرى دەست پێكرنا يارييێ ب (١٠) خولەكان پشت راست بيت و رازيبونا خۆ ديار بكەت لسەر ناڤێت ياريكەران وژمارێت وان وهەمى ئەندامێن تيمێ وراهێنەرى ، ودهەمان دەمدا ياريكەرێن سەرەكى دەست نيشان بكەت ولسەر فورما تۆماركرنێ ئيمزا بكەت ، ودڤێت تيما A ڤى كارى بەراهيێ ئەنجام دەت.

( ٧-٣ ) راهێنەر هاریکارێ راهێنەری (ئەو ئەندامێن ناڤێن وان هاتیە نڤیسین دشێن ل جهێ یەدەکا  رونندخوارێ ئەگەر ناڤێ وان نەبیت نەشێن روینن .

( ٧-٤ ) راهێنەر یان هاریکارێ راهێنەری ئەو نوینەرێن تیمێ نە بۆ وان هەیە ئێکسەر پەیوەندیێ بمێزا تۆمارکرنێ بکەن بۆ زانینا دەمێ یاریێ ، بمەرجەکی تەپە یا مری بیت ، دەمێ یاریێ یێ راوەستیای بیت .

( ٧-٥ ) ئێك ژ راهێنەری یان هاریکارێ وی دشێت راوەستیت زانیاریا بدەتە یاریکەران ئەوژی ل جهێ وی یێ دیارکری.

( ٧-٦ ) ئەگەر ناڤێ هاریکارێ راهێنەری دناڤ فۆرما تۆمارکرنێدا هەبیت (ئیمزا یا وی پێدڤی نینە ) وذشێت کارێن راهێنەری بکەت ئەگەر راهێنەر نەشیایێ بەردەوام بیت بهەر ئەگەرەکی بیت .

( ٧-٧ ) پێدڤیە لسەر راهێنەری ژمارا کابتنی بۆ دادڤانی بێژیت ئەگەر کابتنی یاریگەهـ بجهـ هێلا .

( ٧-٨ ) کابتن دشێت بکارێن راهێنەری راببیت ئەگەر راهێنەر نەشیا بەردەوام ببیت یان ئەگەر ناڤێ هاریکارێ راهێنەری دناڤ فۆرما تۆمارکرنێ دا نەبیت یان نەشیا بەردەوام بیت ئەگەر کابتن دەرکەفتە ژدەرڤەی یاریگەهێ بئەگەرەکێ (شەرعی) (رێ پێ هاتبیتە دان) دشێت یێ بەردەوام بیت بکارێ راهێنەری ، ئەگەر هاتبیتە دویرکرن بئەگەرێ فاولەکا (نەژهەژیاتێ) نەشێت کارێ راهێنەری بکەت وپێگوهۆرێ کابتنی دشێت کارێ راهێنەر بکەت.

( ٧-٩ ) راهێنەر دشێت یاریکەرێ شوتکرنێن ئازاد دەست نیشان بکەت لهەمی دەمێن کو یاسایێ شوتکەرێ شوتکرنێن ئازاد دیارنەکربیت .

## بەندێ-٨- دەمێ یاریێ ، یەکسانبوون ، ودەمێ هاتیە زێدەکرن :

( ٨-١ ) یاری پێك دهێت ژ (٤)  ماوان هەر ماوەیەك  (١٠)خولەکە .

( ٨-٢ ) بێهنڤەدان دناڤبەرا ماوێ (١-٢) و (٣-٤)  ٢ خولەکە ، بەری هەر ماوەیەکێ زێدەکری بێهنڤەدان یا هەی .

( ٨-٣ ) بێهنڤەدان دناڤ بەرا  ماوێ (٢-٣) (١٥) خولەکە دناڤ بەرا نیڤا ئێکێ ونیڤا دووێ .

( ٨-٤ ) بێهنڤەدانا یاریێ دەست پێ دکەت :

١- بەری (٢٠) خولەکان ژ دەست پێکرنا یاریێ .

٢- دەمێ دەنگێ دەمژمێرێ دهێت بۆ دوماهیا ماوەیان .

## بەندێ -٩- دەست  پێك و دوماهیا ماوەیێ یاریێ :

١. یاری دەست پێ دکەت بلێدانا تەپێ ژلایێ ئێك ژدوو یاریکەرێن پشکداریێ دکەن دکریارا تەپا خوهلاڤێشتنێ دا بشێوەکێ یاسایی .

٢. سەرەتایا ماوێن دی دەست پێ دکەت بژورئخستنا تەپێ بشێوەکێ یاسایی پشتی ژ  یاریکەرەکی دگریت دناڤ یاریگەهێدا پشتی هاڤێتنا وێ ژلایێ یاریکەرەکی ڤە ژدەرڤە .

٣. یاری دەست پێ ناکەت ئەگەر تیم ژ (٥) یاریکەرا کێمتر بیت ل دەست پێکا ماوێ ئێکێ .

٤. دهەمی یاریادا پێدڤیە ئەو تیما ناڤێ وێ ئێکەم بیت ل لایێ چەپێ یێ مێزا (دادڤانێ ) تۆمارکرنێ روینیتە خارێ ئاساییە ئەگەر جهێن خۆ بگوهۆرن بمەرجەکی هەردو تیم رازی ببن .

٥. ل دەست پێکا ماوێ ئێکێ وسیێ دشێن راهێنانا بکەن ل سەر سەلکا بەرامبەر.

٦. سەلکا خۆ دێ گوهۆرن ل دەست پێکا نیڤا دووێ یا ن کو پشتی ماوێ ئێکێ ودووێ بدوماهیی دهێت.

٧. ل ماوەیێن زێدەکری ل هەمان سەلك یارییێ دێ کەن کو ل ماوێ چارێ یاری کریە .

٨. دوماهیا هەمی ماوەیان وماوێن زێدەکری بفیرکا دادڤانێ دەمگر بدوماهی دهێت .

٩. ل دوماهیا یارییێ ئەگەر خالێن هەردوو تیمان وەك هەڤبن یاری دێ ئێك ماوێ زێدە هێتە درێژکرن.

١٠. دەمێ ماوەی پێك دهێت ژ (٥) پێنج خولەکان.

١١. ئەگەر بڤی ماوەیێ زێدەکری یاری بیەکسانی ما بەردەوام دەێ (٥) خولەك هێنە زێدەکرن هەتا تیمەك سەرکەڤێت ل دوماهیێ.




وێنەێ ژمارە (٥)

## بەندێ -١٠- حالەتێن تە پێ ( حالات الكرة ) Status of the ball:

(١٠-١) تەپە ب لڤین دهێتە دانان دەمێ :

١. تەپە دهێتە لێدان بشێوەکێ یاسایی ژلایێ ئێك ژوان یاریکەران ئەوێن تەپا خۆهلاڤێتنێ ئەنجام ددەن ( كرة القفز ).

٢. تەپە دبیتە ب لڤین دهێتە دانان دەمێ دادڤان تەپێ ددەتە وی یاریکەرێ شوتکرنا ئازاد ئەنجام ددەت .

٣. دەمێ دادڤان تەپێ ددەتەوی یاریکەرێ کو دێ تەپێ ژدەرڤەی یاریگەهێ کەتە ژناڤدای یاریگەهێ.

## (١٠-٢ ) تە پە ب راوەستیای دهێتە دانان دەمیٚ :

١. لدەمیٚ تۆمارکرنا خالان یان لدەمیٚ شۆتکرنا ئازاد یا سەرکەفتی.

٢. لێدانا فیرکیٚ ژلاییٚ دادڤانیڤە لدەمیٚ تەپەیا بلڤین بیت.

٣. دەمیٚ دیارکو تەپە ناچیتە دسەلکێدا لدەمیٚ شوتکرنا ئازاد وددیفرا ئەڤە هەین .

- شوتکرنەکا دی یا ئازاد .
- سزایەکا دی هەبیت وەکی (شوتکرنەك -شوتکرنێن ئازاد-ب ژورئێخستنا تەپیٚ ) (حیازة).

٤. دەمیٚ دەمگر فیرکیٚ لێددەت بۆ دوماهیا ماوان.

٥. دەمیٚ دمگریٚ ٢٤ چرکا فیرکا ٢٤ چرکان لێددەت.

٦. دەمیٚ یاریکەریٚ هەر تیمەکیٚ دەستیٚ وی بتەپیٚ دکەڤیت وتەپە ل هەوای (بلند) بیت پشتی دەرچونا ویٚ ژدەستیٚ یاریکەریٚ شوت دکەتە گۆلیٚ وپاشی :

أ- هەر دادڤانەك فیرکیٚ لێدەت.

ب- دەمیٚ دادڤانیٚ دەمگر فیرکا دوماهیا ماوەی لێددەت.

ج- دەمیٚ دەمگریٚ (٢٤) چرکان فیرکا دوماهیا هێرشیٚ لێددەت .

## بەندیٚ -١١- جهیٚ یاریزانی ودادڤانی :

ئەو جهیێ یاریکەریە کو ئەویٚ لیٚ راوەستیای وهەردوو پێت وی لسەر ئەردی دجێگیرکرینە ٠ دەمیٚ لهەوای بیت لدەمیٚ خوهلاڤێتنیٚ ئەو جه دیٚ بیتە جهیٚ وی دەمیٚ دهێتە خاریٚ سەر ئەردی . جهیٚ دادڤانیژی دیٚ بهەمان شێویٚ یاریکەری بیت ، دەمیٚ تەپ (بدادڤانی) دکەڤیت دهێتە هژمارتن ب وی جهی دکەڤیت ئەویٚ دادڤان لیٚ راوەستیای .

## بەندیٚ -١٢- تە پا خوهلاڤێتنیٚ (کرة القفز) و دەست خستنا ئالۆگورییٚ ( الحیازة المتبادلة ):

(١٢-١) تەپا خۆهلاڤێتنیٚ دهێتە بجه ئینان دەمیٚ تەپە دهێتە بلندکرن دناڤبەرا دوویاریکەرێن هەردوو تیمێن هەڤرك ل نیڤا بازنا نیڤیٚ ددەست پێکا ماویٚ ئێکیٚ دا.

(١٢-٢ ) دەست خستنا ئال وگورییٚ Alternating possession

باشترین رێکە بۆ بلڤین کرنا تەپیٚ جارەکا دی بۆ دەست پیٚ کرنا یارییٚ ڤەگەریان بۆ هێماییٚ (دەست خستنا ئال وگورییٚ ) ل جهیٚ تەپا خۆهلاڤتنیٚ .

(١٢-٣ ) ئەو تیما مافیٚ دەست خستنیٚ هەی پێدڤیە ل ماویٚ داهاتی ب ژورئێخستنا تەپیٚ ژنیڤا مەیدانیٚ ژدەرڤەیی سنوران بەرامبەری مێزا تۆمارکرنیٚ دەست بیارییٚ بکەت.

(١٢- ٤ ) دەست خستنا ئال وگورییٚ دەست پیٚ دکەت :

- ل وی دەمیٚ تەپە ددەستیٚ یاریکەریدا بۆ ئەنجامدانا ب ژورئێخستنا تەپیٚ.

(١٢-٥) بدوماهیا دهێت دەمێ:

- ❖ بشێوەكێ یاسایی تەپە بهێتە لێدان (دەست كرن) ژلایێ یاریكەرەكی ڤە .
- ❖ ئەو تیما مافێ بژورئێخستنا تەپێ هەی سەرپێچیەكا یاسایی بكەت.
- ❖ تەپەكا بلڤین براوەستینیت لسەر هەلگرێن سەلكێ لدەمێ ب ژورئێخستنا وێ.

(١٢-٦) ئاماژە بوێ تیمێ دهێتە كرن ئەوا دێ تەپێ بژورئێخیت ب (تیرێ دەست خستنا ئالوگوریێ) ، (تیر راستەوخۆ بەری وێ دكەڤیتە سەلكا بەرامبەر) وئەو نیشانە راستەوخۆ بەروڤاژی دهێتەكرن بۆ وێ تیما بەرامبەر مافێ دەست خستنا ئالوگوریێ هەیە ل ماوەیێ داهاتی.

## بەندێ -١٣- چەوا یاری بتە پێ دهێتەكرن:

### (١٣-١) پێناسە

لدەمێ یاری بدەستی دهێتەكرن یان هاڤێتن ، پاسكرن ، پالدان ، گرێلكرن ، یان ئینان وبرنا وێ بۆ هەر ئاراستەكی لدویڤ یاساییێن دناڤ یاساییێن باسكت بۆلێدا هاتین.

## بەندێ -١٤- كونترۆلكرنا تە پێ . Control of the boll:

تیم دەست بسەرداگرتنا تەپێ دكەت لدەمێ هەر یاریكەرەك تەپە لبن كونترۆلا وی بیت بشێوێ گرتن یان تەپ تەپەكرن.

## بەندێ-١٥- یاریكەر دحالەتێ شۆتكرنێ دا بۆ سەلكێ( اللاعب في وضع التصويب ):

شۆتكرن ددەمێ یاریێ دا یان شۆتكرنا ئازاد لسەر گۆلێ ئەو دەم كو تەپە دناڤ دەستێ یاریكەریدا ودهاڤێژتە هەوای (بلند) بۆ ئاراستەی سەلكا تیما بەرامبەر بمەرەما تۆماركرنا خالێ.

## بەندێ -١٦- چەوانیا گۆلكرنێ وبهایێ وێ:

### (١٦-١) پێناسە

خال دهێتە هژمارتن لدەمێ تەپەكا بلڤین دچیتە دناڤ سەلكێ دا وتێرا دبوریت .

١. دشۆتكرنا ئازاد دا بـ (١) خال دهێتە هژمارتن .
٢. لدەمێ دناڤ خیچا سێ خالاندا بیت بـ (٢) خال دهێتە هژمارتن .
٣. لدەمێ ژدەرڤەی خیچا سێ خالاندا بیت بـ (٣) خال دهێتە هژمارتن .

## بەندێ -١٧- تە پا بژورئێخستنێ Throw-in :

بژورئێخستن (رمية الإدخال) پێك دهێت ژهاڤێتنا تەپێ ژلایێ یاریكەرەكیڤە ژدەرڤەی یاریگەهێ ژ پشت خیچا تەنشتێ یان خیچا دوماهیێ بۆ یاریكەرەكی ژناڤدای یاریگەهێ ، پشتی كو دادڤان تەپێ ددەتە یاریكەری ژدەرڤەی یاریگەهێ .

## بەندێ -١٨- داخازكرنا دەمێ ڤەبڕى - charged time-out

### ( ١٨-١ ) پێناسە

راگرتنا دەمێ يارىێ لسەر داخازيا راهێنەرى بۆ ماوێ ئێك خولەك پێك دهێت ژ.

**( ١٨-٢ )** دەمێ ڤەبڕى دەست پێ دكەت وبدوماهى دهێت.

١. دەست پێ دكەت بلێدانا فيركێ ژلايێ دادڤانيڤە وبنيشا دانا هێمايێ دەمێ ڤەبڕى.

٢. بدوماهى دهێت بلێدانا فيركا دادڤانى بۆ بدوماهى هاتنا دەمێ ڤەبڕى.

### ( ١٨-٣ ) دەم دهێتە راوەستاندن ئەگەر:

١. لدەمێ تەپە يا بێ لڤين بيت يان دەمێ يارى يا راوەستياى بيت پشتى پەيوەنديا دادڤانى ياريگەهێ بدادڤانێ تۆماركەرڤە.

٢. تەپە يا بێ لڤين بوو پاشى شۆتكرنا ئازاد بسەركەفتيانە هاتە ئەنجام دان.

٣. بەرى تەپە بهێتەدان بۆ ياريكەرێ شۆتكرنا ئازاد ئەنجام ددەت.

٤. ئەگەر هەر رويدانەكێ دناڤ ياريگەهێ دا رويدا وتيمان داخازا دەمێ ڤەبڕى كر.

- دەمێ ڤەبڕى بدوماهى دهێت ئەگەر تەپە دناڤ دەستێن ياريكەريدا بيت بۆ شۆتكرنێن ئازاد .
- دەمێ ڤەبڕى بۆ هەر تيمەكێ پێك دهێت ژ:

١. ل ماوێ (١ ، ٢ ) دوو دەمێن ڤەبڕى يێن هەين.

٢. ل ماوێ (٣ ، ٤) سێ دەمێن ڤەبڕى يێن هەين.

٣. ل ماوێ زێدەكرى يێ هەر تيمەكێ دەمەكێ ڤەبڕى يێ هەى.

- نەدشياندايە دەمێن ڤەبرێن نيڤا ئێكێ بهێنە ڤەگۆهاستن بۆ نيڤا دووێ يان بۆ ماوێن زێدەكرى.
- ئەگەر راهێنەرى داخازا دەمێ ڤەبرى كر وچ سەرپێچى نەهاتنە ئەنجام دان ئەگەر خال ژلايێ تيما بەرامبەر ڤە هاتنە تۆماركرن دشێى دەمێ ڤەبرى بدەيێ.

## بەندێ -١٩- گوهۆڕينا ياريكەران:

### ( ١٩-١ ) پێناسە

گوهۆڕينا ياريكەرى پێكهاتيە ژهەر راوەستيانەكا يارىێ لسەر داخازا ياريكەرێ يەدەك دا ببيتە ياريكەرەكێ سەرەكى.

**( ١٩-٢ )** دەرفەتا گوهۆڕينێ دەست پێ دكەت دەمێ.

١. تيم دشێت گوهۆڕينا ياريكەرەكى يان پتر بكەت ئەگەر دەمێ گوهۆڕينێ هەبوو.

٢. گوهۆڕين دهێتە ئەنجام دان ئەگەر.

- تەپە يا بێ لڤين بيت ودەم يێ راوەستياى بيت پشتى بدوماهى هاتنا پەيوەنديا دادڤانى دگەل دادڤانێ تۆماركەر.
- تەپە يا بێ لڤين بيت پشتى تۆماركرنا شۆتكرنا ئازاد يا دوماهيێ سەركەفتيانە بۆ هەردوو تيمان.

- پشتی تۆمارکرنا خالان ل (٢) خولەکێن دوماهیێ یێن ماوەیێ چارێ یان هەر ماوەیەکێ زێدەکری بۆ وێ تیما خال لسەر هاتە تۆمارکرن .

**( ١٩-٣ ) دشیاندا نینە گوهۆڕین بهێتەکرن ئەگەر :**

١. تیم ژ (٥) یاریکەران کێمتربیت دناف یاریگەهێ دا .

٢. ئەگەر وی یاریکەری شۆتکرنا ئازاد هەبوو.

**( ١٩-٤ )** بتنێ یاریکەر دشێت داخازا گوهۆڕینێ بکەت پشتی پەیوەندیێ دکەت بدادڤانێ تۆمارکرنێ ڤە .

**( ١٩-٥ )** دشێت گوهۆڕینێ نەکەن بمەرجەکی ئەگەر دادڤانی فیرك لێ نەدابیت بۆ گوهۆڕینا یاریکەری .

**( ١٩-٦ )** دەمێ دادڤانی فیرك لێداو دادڤانی هێمایێ گوهۆڕینێ بلندکر دڤێت یاریکەر چاڤەریێ بکەت تاکو دادڤان رێکێ بدەتێ بچیتە دناف یاریگەهێ دا.

**( ١٩-٧ )** ئەگەر گوهۆڕینەك هەبوو یان فاولا (٥) ێ هاتە تۆمارکرن دڤێت یاریکەر بلەز ئەنجام دەت ئەگەر راوەستیا تاکو (٣٠) چرکان خۆ گیرۆکر دادڤان دشێت فیرکا دەمێ ڤەبڕی لێدەت چونکو (بێ هێجەت ) خوگێرۆکر ئەگەر تێمێ دەمێن ڤەبڕی نەمابن دێ فاولەکا تەکنیکی لسەر راهێنەری هێتەلێدان B٢ .

**( ١٩-٨ )** دشیاندایە گوهۆڕین بهێتەکرن:

- پشتی دوماهی شۆتکرنا ئازاد یاسەرکەفتی .
- هژمارتنا فاولەکێ دناڤبەرا شۆتکرنێن ئازاد دا.
- هژمارتنا خەلەتیەکێ دناف بەرا شۆتکرنێن ئازاد وبەری بجهـ ئینانا فاولا نوی .
- ئەگەر فاولەك هاتە تۆمارکرن بەری کو تەپە دلڤینێدا بیت پشتی ئەنجامدانا شۆتکرنا ئازاد یا دوماهیێ دشیاندایە گوهۆڕین بهێتەکرن بەری کو یاری ب تەپێ بهێتەکرن.
- ئەگەر سەرپێچیەك هاتەکرن دشیاندایە گوهۆڕین بهێتەکرن بەری کو یاری ب تەپێ بهێتەکرن.




وێنەیێ ژمارە ( ٦ )

## بەندێ -٢٠- دۆراندنا یاریێ بخۆڤەکێشانێ: ( خسارة المباراة بالانسحاب ) Me lost by for fit

تیم دهێتە دانان ب دۆراندی یان بخۆڤەکێشانێ دهێتە دۆراندن .

١. ئەگەر تیمەك ئامادە نەبوو یان (٥) یاریکەرێن وێ ئامادە نەبون ل دەست پێکا یاریێ تاکو (١٥) خولەکان پشتی دەمێ دیارکری یێ یاریێ .

٢. ئەنجامدانا هندەك رەفتاران کو ببتە هۆکارێ نەبەردەوامیا یاریێ.

٣. ل دەمێ دەست پێکرنا یاریێ یان هەر دەمێ نەئامادەبون بهێنە ناڤ یاریگەهێ بۆ کرنا یاریێ.

(١-٢٠) سزا :

یاری دێ بۆ هەڤرکی بیت و ئەنجامێ ویژی (٢٠-هیچ) . وهەروەسا تیما خۆڤەکێشای چ خالان ناوەرگریت.

## بەندێ -٢١- دۆراندنا تیمێ ب سەرنەکەفتنێ: ( خسارة المبارة بالإخفاف ) me lost by default

تیم دهێتە هژمارتن دۆراندی ئەگەر یاریکەرێن دناڤ مەیدانێدا ژدوو یاریکەران کیمتربن ددەمێ یاریێ دا.

(١-٢١) سزایێ وێ :

ئەگەر ئەو تیما سەرکەفتی بخالان لپێشیێ بۆ ئەنجام دێ وەکی خۆ مینت لدەمێ دەم لێ راوەستیای وئەگەر لپاش بوو ئەنجام دێ هێتە دان (٢-٠) و تیما دۆراندی دێ خالەکێ وەرگریت درێژبەندا قارەمانییێ دا.

## بەندێ-٢٢- سەرپێچی: ( المخالفات )

شکاندنا یاسایێن یاریێ

سزا یێ وی:

تەپە دهێتە دان بۆ تیما بەرامبەر لنێزیکترین خالا سەرپێچی دێ بژورئێخیتە ڤە ناڤ یاریگەهێ.

## بەندێ -٢٣- یاریکەر لدەرڤەی سنوران و تە پە لدەرڤەی سنۆران :

( ١-٢٣ ) پێناسە Definition

ئەگەر یاریکەر ببەشەکی یان هەمی لەشێ خۆ چو سەر خیچێن رەخان دەمێ تەپە ڤێبیت ئەو بسەرپێچی دهێتە هژمارتن .

(٢-٢٣ ) چونا تە پێ بۆ ژدەرڤە :

دەمێ تەپە بخیچا رەخا یان یێن دوماهیێ دکەڤیت یان ژدەرڤەی یاریگەهێ یان هەر تشتەکی دبیتە سەرپێچی.

## بەندێ -٢٤- تەپ تە پە : ( المحاورة )

پێناسە :

یاریکەریە بشێوەکێ یاسایی تەپ تەپێ دناڤ یاریگەهێدا بکەت .

یاریزانی مافێ هەی تەپ تەپێ بکەت ئەگەر تەپ تەپە نەکربیت.

١. ئەگەر تەپ تەپە کروپاشی گرت بۆ وی نینە تەپ تەپێ بکەت.

٢. یاریکەر نەشێت ب هەردوو دەستان تەپ تەپێ بکەت.

## سزایێ وێ

ئەگەر ڤان سەرپێچیان بکەت دێ بیتە ئەگەرێ ژدەست دانا تەپێ ودێ چیتە دەستێ تیما بەرامبەر.

( ٢٤-١ ) ئەڤ حالەتێن خوارێ ب تەپ تەپەکرن ناهێنە دانان:

١. شۆتکرنێن بسەرئێکڤە ژبۆ گۆلەکێ.

٢. هلنگفتنا بتەپێ ژدەستپێك و دووماهیا تەپ تەپە کرنێ.

٣. هەولا کونترۆل کرنا تەپێ بپالدانا وێ ژبیاڤی یاریکەرێن دی.

٤. لێدانا تەپێ دەمێ تەپە دبن کونترۆلا یاریکەرەکێ دیڤەبیت.

## بەندێ -٢٥- برێڤەچوون بتە پەڤە : الجري

( ٢٥-١ ) یاریکەر دشێت برێڤە بچیت بتەپەڤە بشێوەکێ یاسایی.

( ٢٥-٢ ) یاریکەر دشێت بچیت پشتی تەپ تەپێ (دشێت بتەپ تەپێ بچیت) ئەگەر یاریکەرەکی پێیەك لڤاند وئێکێ دی جێگیرکر بۆ وی نینە وی پێی بلڤینیت وئەگەر هات ولڤاند دێ بیتە سەرپیچیا برێڤەچوونێ بتەپەڤە (هوك).

( ٢٥-٣ ) ئەگەر یاریکەری سێ پێنگاڤی کر ولپێنگاڤا سیێ تەپە ما دناڤ دەستێن ویدا ئەڤە دبیتە سەرپێچیا رێڤەڤەچوونێ بتەپەڤە (هوك).

( ٢٥-٤ ) ئەگەر یاریکەر کەت دناڤ یاریگەهێ دا تەپە ڤێ بو نابیت رابیتەڤە وبەروڤاژی وێ دێ بیتە سەرپیچیا برێڤەچونێ.

## بەندێ -٢٦- ( ٣ ) سێ چرکە : ثلاث ثوان

ئەڤ سەرپێچیە دهێتە رویدان ئەگەر یاریکەرەك ژسێ چرکان پتر دناڤ دەڤەرا قەدەغەکری یا تیما بەرامبەردا بۆ وی دەمێ تەپە لژێر کونترۆلا تیما ویدابیت ودەمژمێر دزڤرینێدابیت.

( ٢٦-١ ) پێدڤیە رێك بۆ وی یاریکەری بهێتەدان کو.

١. دهەولدانێ دایە بۆ بجهـ هێلانا دەڤەرا قەدەغەکری.

٢. ئەو یان ئێك ژهەڤالێن وی دحالەتێ شوتکرنێدابیت و تەپە دحالەتی دەرکەفتنێ دابیت پاشی ژدەستێ یاریکەری دەرکەتبیت بۆ شۆتکرنەکێ.

## بەندێ -٢٧- ( ٨ ) هەشت چرکە : ثمان ثوان

پێدڤیە لسەر یاریکەران دماوێ هەشت چرکان کێمتر تەپێ ژیاریگەها خۆڤەگوهێزنە یاریگەها تیما بەرامبەر.

( ٢٧-١ ) تەپە یالدەڤەرا پێشیێ یا تیمێ دەمێ:

١. تەپە ژ دەڤەرا پێشیێ دگریت.

٢. تەپە بیاریکەرەکی یان دادڤانەکی بکەڤیت کو پارچەك ژ لەشێ وی ژ دەڤەرا پێشیێ بکەڤیت.

٣. تەپە دچیتە دەڤەرا پێشیێ دەمێ تەپ تەپە کرنێ ژ دەڤەرا پاشیێ بۆ دەڤەرا پێشیێ ، هەردوو پیێن تەپتەپە کاری وتەپە دەڤەرا پێشیێ دکەڤن .

( ٢٧-٢ ) هژمارتنا (٨) هەشت چرکان دێ یا بەردەوامبیت ژدەمێ راوەستاندنێ دەمێ تەپە دچیتە ڤهەمان تیما زال لسەر تەپێ بۆ بژورئێخستنەکێ ژ دەڤەرا پاشیێ ژهەمان (٨) هەشت چرکان ئەنجام بو:-

١. دەرکەفتنا تەپێ بۆ دەرڤەی سنوران.

٢. هنگافتنا یاریکەرەکی ژهەمان تیما زال لسەر تەپێ.

٣. حالەتێ تەپا خۆهلاڤێتنێ.

٤. فاولا جوت (المزدوج).

٥. ژێ برنا سزایێن وەك ئێك لسەر هەردوو تیمان.

## بەندێ -٢٨- ( ٢٤ ) بیست و چار چرکە : اربع و عشرون ثانیة

دڤێت یاریکەر تەپێ دماوێ ٢٤ چرکاندان تەپێ شۆتکەنە سەلکا تیما بەرامبەر.

دڤان دەماندا ٢٤ چرکە نوی دبیت

١. ئەگەر تەپە ب (بازنی) کەت ( الحلقة ) - Ring.

٢. ئەگەر یاریکەرێ تیما بەرامبەر بشیوەکێ(ئەنقەسد) پێ خۆ ببەت بۆ تەپێ بەری تەپە بکەڤیت.

٣. ل دووماهیا هەموو فاولان کو دهێنە تۆمارکرن.

٤. ئەگەر یاری ژ لایێ دادڤانیڤە هاتە راوەستاندن و بەرژەوەندیا تیما بەرامبەر ددەمێ ئاسایی دا.

٥. ئەگەر تەپە هەڤپشك بوو ، بەری کو تەپە هەڤپشك بیت ل لایێ تیما بەرامبەر بیت بەری کو فیرکا دادڤانی تەپە بهێتە لایێ وی تیمێ.



وێنەێ ژمارە ( ٧ )

## بەندێ -٢٩- یاریکەرێ دۆر پێچ کری : اللاعب المطبق علیه

**پێناسە :**

ئەگەر یاریکەرەکی کونترۆل لسەر تەپێ کر وبەرەڤان هات بۆ رەخێ وی پێدڤیە تەپ تەپێ بکەت یان پاسەك یان شۆتکەت بەرەڤ سەلکێ ئەگەر ئەڤان نەکەت پێدڤیە ژ (٥) چرکا زێدەتر تەپە نەمینتە لدەڤ .

## بەندێ -٣٠- زڤرینا تە پێ بۆ گورە پانا پاشیێ : عودة الكرة الى الساحة الخلفية

دەمێ تەپە ویاریکەر بتمامی دچنە ناڤ یاریگەها بەرامبەر ئەگەر وی یاریکەری تەپە دگەل بیت بزڤریتە یاریگەها پاشێ یان بەر خیچا نیڤێ بکەڤیت ئەڤە دبیتە سەرپێچیا زڤرینا تەپێ .

## بەندێ -٣١- کارتێکرن لسەر گۆلێ وریگرتنا تە پێ : التأثير على الهدف

ئەگەر تەپە هاتە شۆتکرن بۆ سەلکێ ددەمێ دهێتە خوارێ دوی دەمیدا کارتێکرن لسەر بهێتەکرن ژلایێ بەرەڤانانڤە ئەڤە بسەرپێچی دهێنە هژمارتن وخال دهێنە تۆمارکرن یان رێگرییێ بکەن بۆ چونا تەپێ دناڤ سەلکێدا.

**( ٣١-١ )** شۆتکرن بۆ سەلکێ بو تۆمارکرنا خالان :

- دەست پێ دکەت دەمێ تەپەکا (بلڤین) ژ دەستێن یاریکەرەکێ دەردکەڤیت دحالەتێ شۆتکرنێدا.
- بدوماهی دهێت دەمێ تەپە:-

١. دیاربوو کو ناچیتە دسەلکێ دا .
٢. ژ بازنێ بگریت.
٣. ژ ئەردی بگریت.
٤. دێ بیتە راوەستیای.

**( ٣١-٢ )** کارتێکرن لسەر گۆلێ رووی ددەت لدەمێ شۆتکرنێ بۆ سەلکێ لدەمێ یاریکەر بتەپێ دکەڤیت کو بتمامی لسەر ئاستێ خەلەکێ :

١. لحالەتێ هاتنە خارێ بۆ سەلکێ .
٢. پشتی ببۆردی دکەڤیت.

**( ٣١-٣ )** ئەگەر دەرکەتن ژ یاسایێ هاتە ئەنجامدان ژ لایێ یاریزانێ بەرەڤانێ تیما بەرڤە:

١. (١) ئێك خال دێ دەتێ د حالەتێ شۆتکرنا ئازاد دا بو شوتکرنا ئازاد (رمية الحرة).
٢. (٢) دوو خال دێ دەنێ ئەگەر تەپە ددەڤەرا شۆتکرنا دوو خالان بوو.
٣. (٣) سێ خال دێ دەنێ ئەگەر تەپە ددەڤەرا شۆتکرنا سێ خالان بوو.

## بەندێ -٣٢- فاول : الآخطاء : Fouls

شکاندنا یاسا وڤێك کەتنا کەسەکێ دگەل بەرامبەرەکێ یان کرنا رەوشتەکێ نەیا سایی دویر ژ گیانێ وەرزشی.

### سزایێ وی:

دانا تەپێ بۆ تیما بەرامبەر وتۆمارکرنا فاولەکێ لسەر یاریکەری و تیمێ .

یاریکەر دشێت بشێوەکێ یاسایی بەرگریێ ژ سەلکێ بکەت وتەپە دناڤ یاریگەهێ دا.

## بەندێ -٣٣- فاولا کەسایەتی : الخطأ الشخصي : Personal Fouls

بەرگری کرنە بشێوەکێ نەیاسایی ودبیتە چەند پارچە

١. راکێشان
٢. گرتن
٣. پالدان (دفع)
٤. رێ گرتن (ألأعاقة)

### سزایا فاولا کەسایەتی (الخطأ الشخصي)

١. نڤیسینا فاولێ لسەر یاریکەری. (P)
٢. ئەگەر دوخال تۆمارکرن ئێك شۆتکرنا ئازاد دێ دەنێ P١ ودێ نڤیسن.
٣. ئەگەر د سێ پێنگاڤیێ دا بوو یان دشۆتکرنا دوو خالاندا بوو بۆ سەلکێ وخال نەهاتنە تۆمارکرن دو شۆتکرنێن ئازاد دێ دەنێ P٢ ودێ لسەر یاریکەری هێنە نڤیسان.
٤. ئەگەر دشۆتکرنا سێ خالاندا بیت بۆ سەلکێ وسێ خال هاتنە تۆمارکرن ئێك شۆتکرنا ئازاد دێ بۆ هێتە دان (P١) بەلێ ئەگەر نەهاتنە تۆمارکرن سێ شوتکرنێن ئازاد دێ هێنە دان (P٣) لسەر یاریکەرێ دێ هێنە نڤیسان.



وێنەیێ ژمارە (٨)

## بەندێ -٣٤- فاولا جۆت : الخطأ المزدوج : Double Foul

کرنا دوو فاولان ژلایێ دو یاریکەرێن هەر دوو تیمێن دژی ئێك دهەمان دەمدا.

**سزایێ وی :**

تۆمارکرنا فاولا کەسایەتی لسەر هەردوو یاریکەران • بێی دانا شۆتکرنێن ئازاد ( الرمية الحرة).

١. ئەگەر تەپە ل ڕەخێ تیما A بیت دێ چیتە لایێ هەمان تیم .

٢. ئەگەر تەپە ل ڕەخێ تیما B بیت دێ چیتە لایێ هەمان تیم .

٣. ئەگەر تەپە ل هەوای بوو دێ لسەر هێمایێ دەست خستنا بئال وگوریێ چن بۆ زانین تەپە بچیتە لایێ کیشك ژ وان .

## بەندێ -٣٥- فاولا رەوشتێ نەباش : خطأ سوء السلوك

ئەگەر یاریکەرەك فاولەکا بکەت ، یان یاریکەرەك بتنێ بەرەف سەلکا تیما بەرامبەر بچیت و چ یاریکەر نەبن دناڤبەرا وی وسەلکێدا کارتێکرنێ لسەر بکەت یان فاولێ ئەنجام دەت.

**سزایێ وی:**

١. دانا دوو شۆتکرنێن ئازاد ودانا تەپێ دپشتی شۆتکرنا U٢ دێ هێتە نڤیسان لفورما یاریێ.

٢. ئەگەر خالژی هاتینە تۆمارکرن دانا ئێك شۆتکرنا ئازاد دگەل دانا تەپێ پشتی شۆتکرنێ (U١) دێ هێتە نڤیسان .

٣. ئەگەر دشۆتکرنا سێ خالاندا بیت دێ سێ شۆتکرنێن ئازاد هێنە دان و دانا تەپێ پشتی شۆتکرنا (U٣) دێ هێتە نڤیسان دفورما تۆمارکرنێدا بەرامبەری ناڤێ یاریکەری.

٤. ئەگەر یاریکەری دو فاولێن ئەنجام دان ئێکسەر دێ هێتە دەرئێخستن ودێ بیتە (نەژهەژیاتی) .

## بەندێ -٣٦- فاولا نەژهەژی: خطأ عدم الاهلية

ئەو فاولەیە کو (یاریکەر -راهێنەر -هاریکارێ راهێنەری -هەر ئێك ژ ئەندامێن تیمێ ) بشێوەکێ نەوەرزشی ئەنجام ددەت وەکو (شەرکرن ، تف کرن ، ئاخفتنێن نەشرین ......)

**سزایێ وی:**

١. دویرئێخستن ژیاریگەهێ ونابیت ل جهێ یەدەکان ژی روینتە خارێ.

٢. دوو شۆتکرنێن ئازاد • دگەل دانا تەپێ پشتی شۆتکرنا بۆ هەمان تیمێ.

٣. دفۆرما تۆمارکرنێدا D٢ دهێتە نڤیسین.

## بەندێ -٣٧- فاولا هونەری : خطأ الفني : Technical foul (T٢)

ئەڤ فاولە بشیوێ ئاخفتن دهێتەکرن وەکو (رەخنەگرتن ل دادڤانی ) ئانکو ژئێك گرتن نینە دناڤ بەرا یاریزانێن تیما بەرامبەر دا.

**سزایێ وی:**

دو شۆتکرنێن ئازاد ودگەل دانا تەپێ بۆ هەمان تیم بۆ دەست پێکرنا یاریێ ژنیڤا مەیدانێ .

( ٣٧-١ ) ئەگەر فاولا هونەری هاتە ئەنجام دان:

١. ئەگەر یاریکەرێ ل ناڤ مەیدانێ ئەنجام دەت دێ لسەرهێتە تۆمارکرن دێ هێتە نڤیسان ($T_2$).
٢. ئەگەر (هاریکارێ راهێنەری ، یاریزانێ یەدەك ، پشتەڤانێن تیمێ ) ئەنجام بدەن دێ لسەر راهێنەری هێتە تۆمارکرن ب دێ هێتە نڤیسین (B).
٣. فاولا هونەری لسەر راهێنەری دی هێتە نڤیسین C٢.
٤. دو فاولێن هونەری هاتنە تۆمارکرن لسەر راهێنەری دێ ئێکسەر هێتە دەرئێخستن.
٥. ئەگەر سێ فاولێن هونەری هاتنە تۆمارکرن لسەر هاریکارێ راهێنەری دێ ئێکسەر هێتە دەرئێخستن.

## بەندێ -٣٨- پێنج فاولێن یاریکەری : خمسة أخطاء على اللاعب

ئەگەر یاریکەرەکی پێنج فاول کرن دێ هێتە دویرئێخستن ژیاریێ ویاریکەرەکێ دی دێ هێتە جهێ وی.

( ٣٨-١ ) فاولا دهێتە ئەنجام دان ژلایێ وی یاریکەرێ شنی فاولا خویا پێنجێ ئەنجام دای دهێتە هژمارتن ژفاولێن (جودا) ولسەر راهێنەری دهێتە هژمارتن ودهێتە تۆمارکرن B.

## بەندێ -٣٩- فاولێن تیمێ : اخطاء الفريق

١. ئەگەر دماوەیەکی دا چار فاول هاتنە ئەنجام دان دێ پشتی فاولا چارێ دوو شوتکرنێن ئازاد هینەدان.
٢. ئەم ئەڤ چار فاولە تەنها بۆ ماوەیەکی نە وماوەیێن دی تازە دبن ونامینن.

( ٣٩-١ ) هەمی فاولێن تیمێ ئەوێن دناڤ هەر بێهن ڤەدانەکێ دا هاتینە ئەنجامدان هەر وەکو دناڤ ماوەێ یان ماوێ زێدەکریدا هاتینە ئەنجامدان.

( ٣٩-٢ ) هەمی فاولێن تیمێ یێن هاتینە ئەنجامدان دهەر ماوەکێ زێدەکریدا وەکی بەشەکی ژمارێ چارێ دهێنە هژمارتن.

## بەندێ -٤٠- داوەر: الحكام

یاریا باسکت بۆلێ پێدڤی ب (٣) دادڤانێن مەیدانێ ، و (٤) چوار دادڤانێن مێزێ هەیە ، کو پێك هاتینە ژ (دەم گر ، تۆمارکەر، دەمگرێ ٢٤ چرکان ، هاریکارێ تۆمارکەری ).



وێنەێ ژمارە (٩)

### جل وبەرکێن دادڤانان:

١. کالەکارەش
٢. پەنتەلونەکێ رەش
٣. تشێرتێ رەش و رساسی
٤. ڤایشا رەش
٥. فیرك.

## بەندێ -٤١- دادڤانێ ئێكێ ئەرك ودەست هەلاتێن وی :

١. پێدڤیە ئەو ئامیر وپێدڤیێن كودێ بۆ یارێ بكارهێن بپشكنیت .
٢. دانانا دەمژمێرا یاریێ ودەمژمێرا ٢٤ چركان پشت راستبوون ژكاركرنا وان.
٣. هەلبژاردنا تەپا یاریێ.
٤. رێ نەدەتە یاریكەران بۆ بكارئینانا وان كەرەستێن دبنە هۆكارێ بریندار بوونا یاریكەران.
٥. بلندكرنا تەپێ دەستپێكا ماوێ ئێكێ دناڤبەرا هەردوو تیماندا بۆ دەست پێكرنا یاریێ.
٦. راوەستاندنا یاریێ لدەمێ پێدڤی.
٧. دەست هەلات یا هەی تیمێ ب ڤەكێشای ژیاریێ دانیت.
٨. تەماشەكرنا فورما تۆماركرنێ لدوماهیا یاریێ و لهەر دەمەكێ پێدڤی.
٩. دادڤان دێ ئیمزایێ لسەر فورما تۆماركرنێ كەت لدوماهیا یاریێ ودادڤانی دەست هەلات یا هەی بەری دەست پێكرنا یاریێ ب (٢٠) خولەكان .
١٠. ئەگەر خۆڤەكێشانێ رویدا یان رەفتارەكا نەشرین ژلایێ (راهێنەر ، هاریكارێ راهێنەری ، یاریكەرێن یەدەك، هەر ئێك ژ ئەندامێن تیمێ ) بەری دەست پێكرنا یاریێ ب (٢٠) خولەكان یان دناڤ هەر ماوەیەكیدا پێدڤیە لسەر دادڤانێ ئێكێ بەری ئیمزاكرنا فورمێ راستیا رویدانا تۆماربكەت ودادڤانێ ئێكێ یان سەر پەرشتێ هونەری راپۆرتەكێ بنڤیسیت لسەر یاریێ .
١١. دشێت بریارا دوماهیێ بدەت دەهبوونا جیاوازیێدا پشتی گفت وگو كرنێ دگەل دادڤانێ (٢ - ٣) وسەرپەرشتێ هونەری ودادڤانێن مێزی.
١٢. ئەگەر فیركا دوماهیا یاریێ هاتە لێدان ژلایێ دادڤانێ دەمیڤە پشت راست نەبوو ژوێ خالا هاتیە تۆماركرن لدەمێ بدوماهی هاتنا یاریێ دشێت دگەل دادڤانێ دەمگر وسەرپەرشتێ هونەری باخڤیت وپاشی بریارێ بدەت.
١٣. دشێت بریارێ لسەر هەر بریارەكا د یاسایێ دانە یا روون بیت بدەت ورون بكەت.

## بەندێ -٤٢- دادڤانێن سەرمێزێ :

پێكهاتینە ژ تۆماركەری / هاریكارێ تۆماركەری / دەمگر / دەمگرێ ٢٤ چركان .

## بەندێ -٤٣- تۆماركەر / هاریكارێ تۆماركەری / ئەركێن وان :

١. بكارئینانا فورما تۆماركرنێ.
٢. نڤیسینا ناڤێن یاریكەران وئەندامێن تیمێ.
٣. دەستنیشانكرنا (٥) یاریكەرێن سەرەكی ل دەستپێكا یاریێ.

٤. نڤيسينا فاولان لسەر (راهێنەر -هاريكارێ راهێنەر -ياريكەران )

٥. ئاگەهدار كرنا دادڤانى ب (٥) فاولێن ياريكەرى و (٤) فاولێن تيمێ.

٦. دەست نيشانكرنا ئاراستا تەپێ لدەستپێكا ماوەى برێكا لڤاندنا نيشانا دەست خستنا بئال وگورييێ.

٧. كومكرنا خالێن هەردوو تيمان.

٨. تژى كرنا زانياريا لسەر فورما تۆماركرنێ براستى وبێ خەلەتى.

٩. نڤيسينا دەمێن ڤەبرِى • ولدەمێ وەرگرتنا دەمى ئاگەهداريا دادڤانى بكەت.

## بەندێ -٤٤- دەمگر :

### ( ٤٤-١ ) دەمگر - ئەركێن وى :

١. هژمارتنا دەمێ يارييێ ، دەمێ ڤەبرِى ، دەمێ بێهن ڤەدانێ.

٢. لدوماهيا هەمى ماوەيان فيركا دوماهييێ لێددەت.

٣. ئاگەهداركرنا ياريكەران ودادڤانان بسێ خولەكان بەرى دەست پێكا ماوێ ئێكى وسييێ.

٤. دادڤانێن ناڤ ياريگەهێ بهەر خە لەتيەكێ ئاگەهدار دكەت.

### ( ٤٤-٢ ) دەمێ يارێ دەست پێ دكەت :

١. بلێدانا تەپێ بشێوەكێ ياسايى ژلايێ هەر ئێك ژهەردوو ياريكەرێن خۆ بلند دكەن بۆ لێدانا تەپا خۆهلاڤێتنێ ( كرة القفز).

٢. پشتى شۆتكرنا نەسەركەفتى پشتى كو تەپێ ژياريكەرەكى گرتى دناڤ ياريگەهێ دا.

٣. پشتى كو ياريكەر تەپێ بزورئێخيتە ناڤ ياريگەهێ وبدەستێ ياريكەرەكێ دكەڤيت.

### ( ٤٤-٣ ) دەم دراوەستيت :

١. دوماهى تمام بوونا دەمێ ماوەيان (الفترات) .

٢. لێدانا فيركێ ژلايێ دادڤانەكى ڤە دەمێ تەپە يا بلڤين بوو.

٣. پشتى رويدانا هەر (پێكانێكى) دناڤ ياريگەهێدا يان داخازا دەمێ ڤەبرى .

٤. ل دوو خولەكێن دوماهيا ماوێ چارێ وماوێ زێدەكرى پشتى تۆماركرنا خالان.

٥. پشتى لێدان فيركێ ژلايێ دەمگرێ ٢٤ چركانڤە.

## بەندێ -٤٥- دەمگرێ ٢٤ چرکان ئەرکێن وی :

دەست پێکرنا ٢٤ چرکان:

دەمێ تەپە بدەستێ یاریکەری دکەڤیت وبشێوەکێ یاسایی.

### ( ٤٥-١ ) نویکرن وراوەستاندنا ٢٤ چرکان :

١. دەمێ دادڤان فیرکا سەرپێچێ یان فاولێ لێددەت.

٢. دەمێ تەپە دچیتە د سەلکێدا.

٣. دەمێ تەپە بازنەی دکەڤیت.

٤. دەمێ یاری دهێتە راوەستاندن ب هۆکارێ (رویدانەکێ) دبەرژەوەندیا وێ تیمێدا بیت ئەوا تەپەڤێ نەبیت.

### ( ٤٥ - ٢ ) ٢٤ چرکە نوی نابیت دەمێ هەمان تیم کونترۆلێ لسەر تە پێ بکەت وتە پا بژورئێخستی ددەنێ ژ ئە نجامی :

١. چونا ژدەرڤە یا تەپێ.

٢. (پێکانی) یاریکەرێن هەمان تیما کو تەپە دکونترولاواندا.

٣. حالەتێ تەپا خوهلاڤێتنێ ( كرة القفز)

٤. فاولا جۆت (خطأ المزدوج).

٥. ژێ برنا هەمی سزایێن لسەر هەردوو تیمان .(جزاءت متساوية ).



وێنەی ژمارە (١٠)

## هێمایێن خالێن هاتینە تۆمارکرن










نیشانێت دادڤانی ( اشارات التحكيم )




هیماییێن سەرپیێچایا (المخالفة)




هێمایێ هژمارا




هێماییێن خەلەتییا

## هێمایێت هژمارا هاڤێتنیٚ ئازاد




**هێمایا ئاراستا یارییٚ**




**هێمایا دەمیٚ دادڤان تە پیٚ بدەتە یاریزانیٚ هاڤێتنا ئازاد**




**هێمایا راوەستانا دادڤانی ژدەرڤەی خیچا هاڤێتنا ئازاد**




FEDERATION INTERNATIONALE DE BASKETBALL
INTERNATIONAL BASKETBALL FEDERATION

## SCORESHEET

فورما تومارکرنێ

Team A ______________________ Team B ______________________

Competition ______ Date ________ Time ________ Referee ____________________
Game No. ______ Place ____________ Umpire 1 __________ Umpire 2 __________

**Team A** ______________________

Time-outs

Team fouls
Period ① 1 2 3 4 ② 1 2 3 4
Period ③ 1 2 3 4 ④ 1 2 3 4
Extra periods

| Licence no. | Players | No. | Player in | Fouls 1 | 2 | 3 | 4 | 5 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | 4 | | | | | | |
| | | 5 | | | | | | |
| | | 6 | | | | | | |
| | | 7 | | | | | | |
| | | 8 | | | | | | |
| | | 9 | | | | | | |
| | | 10 | | | | | | |
| | | 11 | | | | | | |
| | | 12 | | | | | | |
| | | 13 | | | | | | |
| | | 14 | | | | | | |
| | | 15 | | | | | | |
| Coach | | | | | | | | |
| Assistant Coach | | | | | | | | |

**Team B** ______________________

Time-outs

Team fouls
Period ① 1 2 3 4 ② 1 2 3 4
Period ③ 1 2 3 4 ④ 1 2 3 4
Extra periods

| Licence no. | Players | No. | Player in | Fouls 1 | 2 | 3 | 4 | 5 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | 4 | | | | | | |
| | | 5 | | | | | | |
| | | 6 | | | | | | |
| | | 7 | | | | | | |
| | | 8 | | | | | | |
| | | 9 | | | | | | |
| | | 10 | | | | | | |
| | | 11 | | | | | | |
| | | 12 | | | | | | |
| | | 13 | | | | | | |
| | | 14 | | | | | | |
| | | 15 | | | | | | |
| Coach | | | | | | | | |
| Assistant Coach | | | | | | | | |

**RUNNING SCORE**

| A | B | A | B | A | B | A | B |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | 1 | 41 | 41 | 81 | 81 | 121 | 121 |
| 2 | 2 | 42 | 42 | 82 | 82 | 122 | 122 |
| 3 | 3 | 43 | 43 | 83 | 83 | 123 | 123 |
| 4 | 4 | 44 | 44 | 84 | 84 | 124 | 124 |
| 5 | 5 | 45 | 45 | 85 | 85 | 125 | 125 |
| 6 | 6 | 46 | 46 | 86 | 86 | 126 | 126 |
| 7 | 7 | 47 | 47 | 87 | 87 | 127 | 127 |
| 8 | 8 | 48 | 48 | 88 | 88 | 128 | 128 |
| 9 | 9 | 49 | 49 | 89 | 89 | 129 | 129 |
| 10 | 10 | 50 | 50 | 90 | 90 | 130 | 130 |
| 11 | 11 | 51 | 51 | 91 | 91 | 131 | 131 |
| 12 | 12 | 52 | 52 | 92 | 92 | 132 | 132 |
| 13 | 13 | 53 | 53 | 93 | 93 | 133 | 133 |
| 14 | 14 | 54 | 54 | 94 | 94 | 134 | 134 |
| 15 | 15 | 55 | 55 | 95 | 95 | 135 | 135 |
| 16 | 16 | 56 | 56 | 96 | 96 | 136 | 136 |
| 17 | 17 | 57 | 57 | 97 | 97 | 137 | 137 |
| 18 | 18 | 58 | 58 | 98 | 98 | 138 | 138 |
| 19 | 19 | 59 | 59 | 99 | 99 | 139 | 139 |
| 20 | 20 | 60 | 60 | 100 | 100 | 140 | 140 |
| 21 | 21 | 61 | 61 | 101 | 101 | 141 | 141 |
| 22 | 22 | 62 | 62 | 102 | 102 | 142 | 142 |
| 23 | 23 | 63 | 63 | 103 | 103 | 143 | 143 |
| 24 | 24 | 64 | 64 | 104 | 104 | 144 | 144 |
| 25 | 25 | 65 | 65 | 105 | 105 | 145 | 145 |
| 26 | 26 | 66 | 66 | 106 | 106 | 146 | 146 |
| 27 | 27 | 67 | 67 | 107 | 107 | 147 | 147 |
| 28 | 28 | 68 | 68 | 108 | 108 | 148 | 148 |
| 29 | 29 | 69 | 69 | 109 | 109 | 149 | 149 |
| 30 | 30 | 70 | 70 | 110 | 110 | 150 | 150 |
| 31 | 31 | 71 | 71 | 111 | 111 | 151 | 151 |
| 32 | 32 | 72 | 72 | 112 | 112 | 152 | 152 |
| 33 | 33 | 73 | 73 | 113 | 113 | 153 | 153 |
| 34 | 34 | 74 | 74 | 114 | 114 | 154 | 154 |
| 35 | 35 | 75 | 75 | 115 | 115 | 155 | 155 |
| 36 | 36 | 76 | 76 | 116 | 116 | 156 | 156 |
| 37 | 37 | 77 | 77 | 117 | 117 | 157 | 157 |
| 38 | 38 | 78 | 78 | 118 | 118 | 158 | 158 |
| 39 | 39 | 79 | 79 | 119 | 119 | 159 | 159 |
| 40 | 40 | 80 | 80 | 120 | 120 | 160 | 160 |

Scorer ____________
Assistant scorer ____________
Timekeeper ____________
24" operator ____________

Scores After period ① A ____ B ____
After period ② A ____ B ____
After period ③ A ____ B ____
Before extra periods A ____ B ____

Referee ____________
Umpire 1 ________ Umpire 2 ________
Coach signature in case of protest ____________

Final Score Team A ____ Team B ____
Name of winning team ____________

---

## ژێدەر


أ- یاسا نیف دەولەتی یا تەپا سەلکێ (٢٠١٠)-دادڤانێ دەولەی / مۆید سامی عباس
دادڤانێ دەولەی / د. علی سموم فرگوسی

ب- راسفەکرنێن تەپا سەلکێ - دادڤانێ دەولەی / مۆیدسامی عباس

## پرسیارێن پێداچونا یاسایی
## تەپا باسکت بۆلێ

پ ١/ درێژی وپاناتیا یاریگەها نیف دەولەتی یا باسکت بۆلێ چەندە ؟

پ ٢/ دویراتیا خیچا شوتکرنێن ٣ سێ خالی ژ خالا نیفا (خەلەکێ) یا لسەر ئەردی چەندە ؟

پ ٣/ ژمارێن تیشێرتێن یاریکەران ژ ژمارە چەند دەست پێ دکەن ؟

پ ٤/ تیم دشێت چەند یاریکەران ژمارێن وان دسەر ژمارە (١٥) دا دانیت ؟

پ ٥/ بەحسێ دوو ژ کارێن کابتنی بکە ؟

پ ٦/ چەند خولەکا بەری دەست پێکرنا یارێ پێدفیە راهێنەر لیستا ناڤێن یاریکەران پێشکێشی دادڤانێ مێزێ بکەت؟

پ ٧/ یاری ژ چەند ماوەیان پێك دهێت ؟

پ ٨/ بێهنڤەدانا دناڤبەرا ماوێ دووێ وسییێ چەند خولەکن ؟

پ ٩/ یاریا باسکت بۆلێ چەوا دەست پێ دکەت ؟

پ ١٠/ کەنگی تەپە براوەستیای دهێتە هژمارتن دوو ژوان حالەتان بەحس بکە ؟

پ ١١/ شوتکرنا ئازاد بچەند خالان دهێتە هژمارتن ؟

پ ١٢/ ل ماوێ ئێکێ و دووێ چەند دەمێن ڤەبری هەنە ؟

پ ١٣ / هەر تیمەك دشێت چەند گوهۆرینان بکەت دیارییێ دا ؟

پ ١٤ / دۆراندن بخۆڤە کێشانێ چیە ؟ بەحس بکە ؟

پ ١٥ / (سەرپێچی) پێناسەکە ؟

پ ١٦/ سێ جورێن سەرپێچیان بێژە ؟

پ ١٧/ فاول چیە بەحس بکە ٠ جۆرێن فاولان بژمێرە ؟

پ ١٨/ سزایا فاولا تەکنیکی چیە ؟ و بچ هێما ل فورما تۆمارکرنێ دهێتە نقیسان ؟

پ ١٩/ یاریکەر بچەند فاولان یاریگەهێ بجهـ دهێلیت ؟

پ ٢٠/ جل وبەرگێن تایبەت بدادڤان چنە ؟

پ ٢١/ دەمژمێر بۆ چ بکاردهێت و چەند جورێن دەمی هەنە ؟

پ ٢٢/ بەحسێ ئەرکێن دادڤانێ ئێکێ بکە ؟

پ ٢٣/ بەحسێ کارێن دادڤانێن مێزێ بکە ؟

پ ٢٤/ کەنگی دەمێ یارییێ دەست پێ دکەت ؟

پ ٢٥/ کەنگی دەم رادوەستیت ؟

# بـــەشـێ دووێ

# كورتیەك ژیاسایا یاریا ڤۆلی بۆلێ




## لیژنا ئامادەكرنێ


شهاب احمد امین
سەرپەرشتیارێ پسپۆرێ وەرزشی

صدیق اسماعیل باپیر
سەرپەرشتیارێ پسپۆرێ وەرزشی

# یاساییێن ڤۆلی بۆلیٚ

## مادده -١- دەڤەرا یاریێ (منطقة اللعب):

ئەڤێ ڤەدگریت (یاریگەهـ ودەڤەرا ئازاد ) و دڤێت لاکیشه بیت و وەکی ئێك بیت.

### درێژی و پاناتی ( الابعاد )

ئەردێ یاریگەهێ پێکهاتیه ژ لاکیشەکێ درێژاهیا وێ (١٨ م) وپاناتیا وێ (٩ م) ە ، و لدەوٚر و بەرێن دەڤەرا ئازاد هەیە تاکو (٥ م) ژ خیچێن رەخان و (٨ م) ژ خیچێن دوماهیێ و هیچ ئاستەنگ تێدا نەبن . (بلنداهیا) دەڤەرا ئازاد دڤێت ژ ٧م کێمتر نەبیت بۆ یاریێن دەولەتی ئەوێن ئێکەتیا دەولەتی یا ڤۆلی بۆلیٚ رێك دئیخیت دڤێت (١٢،٥) کێمتر نەبیت.

### خیچێن یاریگەهێ ( خطوط الملعب )

دڤێت هەمی خیچێن یاریگەهێ پاناتیا وان (٥ سم) بن وبرەنگەکێ ڤەکری وجودا ژ رەنگێ ئەردی وخیچێن دی.

### خیچا نیڤێ ( خط المنتصف )

ئەڤ خیچە یاریگەهێ دکەتە دوو یاریگەهێن هندی ئێك (٩ × ٩) و پاناتیا ڤێ خیچێژی (٥) سم وئەڤ خیچە دکەڤیتە بن تورێ ژ خیچا رەخی تاکو خیچا رەخی.

### خیچا هێرش برنێ ( خط الهجوم )

ئەڤ خیچە دەڤەرا پێشیێ دیاردکەت بدرێژیا (٣ م) دهێتە کێشان ژ هێلا ناڤەراست.

### دەڤەرا سێرڤێ ( منطقة الارسال )

ئەڤ دەڤەرە بپاناتیا (٩ م) پشت خیچا دوماهیێ دهێتە دیارکرن بدوو خیچێن کورت هەر ئێك (١٥ سم) دهێتە نیگارکرن پشتی (٢٠ سم) ژ خیچا دوماهیێ دهێتە درێژکرن وەکو تمامکەرێ دوو خیچێن تەنشتا و هەردوو خیچێن کورت بدەڤەرا سێرڤێ دهێنە هژمارتن.




وێنێ كوره پانێ دگەل تورێ

## مادده -٢- تۆروستوینك :

### ١- بلنداهیا تۆرێ ( ارتفاع الشبكة )

تۆر دهێته دانان لسەر خیچا نیڤێ و بلنداهیا وێ ٢،٤٣ بۆ زەلامان و ٢،٢٤ بۆ ئافرەتا.

### ٢- دوو دارێن هەوائی ( العصاتان الهوائیتان )

دارێن هەوائی دوو پارچێن دارێن نەرمن درێژاهیا وان ١،٨ م وپاناتی (١٠ ملم) یێن هاتینه چێكرن ژ پلاستیكێ شیشەیی (الآلیاف الزجاجیة) .

دهێته شداندن دگەل تۆرێ لسەر هەردوو خیچێن رەخێن یاریگەهێ (١)متر دگەل تۆرێ و ٨٠ سم لسەر تۆرێ و پێدڤیه ئەوا لسەر تۆرێ یا رەنگا رەنگ و بیت وباشتره رەنگێ سۆر وسپی بیت تەپە دێ هاتن و چونێ دناڤ ڤان هەردوو داراندا كەت .

### ٣- تۆر ( الشبكة )

پاناتیا تۆرێ ئێك متره و درێژاهیا وێ ٩،٥ میتره دگەل ٢٥ سم ژهەر لایەكی زێده دكەت ژ خیچێن رەخان چونكی پاناتیا یاریگەهێ ٩ میتره ئەو زێدەهیه ژی بشەریتەكێ قوماشێ سپی ٥ سم دهێته دیاركرن.

## ٤- هەردوو ستوینك ( العمودان – القائمان )

دهێنە دانان وتۆڕ پێڤە دهێتە گرێدان بدووراتیا ٥٠-١٠٠ سم ژ هەردوو خیچێن رەخێن یاریگەهێ وبلنداهیا ستوینكا ژ سەر ئەردێ یاریگەهێ ٢,٥٥ م.




وێنێ تۆڕێ وستوینكا

پاناتیا تۆڕێ (١)م ودرێژاهیا تۆڕێ (٩,٥)م وبلنداهیا ستوینكا ٢,٥٥ م زەوی یاریگا (٢,٥٥)م

## مادده -٣- تە پە :

دڤێت تەپەیا گوروڤر بیت وبهێتە دروست كرن ژ پیستێ نەرم یان پیستێ پیشەسازی ودناڤدا كیسەكێ نەرم یێ هەی ژ (مطاطي) هاتیە دروست كرن .

دڤێت رەنگێ وی زەر وشین تاری بیت (نیلی)

١- چێوێ تەپێ (محیط الكرة): (٦٥-٦٧)سم

٢- كێشێ تەپێ (وزن الكرة): (٢٦٠-٢٨٠)گرامە

٣- پەستانا تەپێ : (٠,٣٠-٠,٣٢٥)كگم/سم٢ یان (٢٩٤,٣-٣١٨,٨٢) ملیار یان هكتو باسكال.

٤- ددەمێ یاریێ دا پێدڤیە هەمی ئەو تەپێن دهێنە بكارئینان چیوە وپەستانا دناڤ تەپێ وجۆر رەنگێن وان وەكو ئێك بن.

## مادده -٤- پشكدار : المشاركون

### تيم : الفريق

### ❖ پێكهاتنا تيمێ : تكوين الفريق

❖ تيم ژ (١٤) ياريكەران پێك دهێت دگەل راهێنەری وهاريكارێ راهێنەری و نوژدارێ مرۆڤان .

❖ ودڤێت ياريكەرەك ببيتە كابتنێ تيمێ بەلێ ياريكەرێ بەرەڤانێ ئازاد (ليبرو) نەبيت .

❖ ودڤێت ئاماژە پێ بهێتەكرن دفۆرما تۆماركرنێ دا.

- پێدڤيە تيشێرت وشۆرت وپێلاڤ وگورێن وەرزشێ ل بەر ياريكەرابن ددەمێ ياريكرنێ دا.
- پێدڤيە ژمارێن تيشێرتێن ياريكەران ژ (١ - ٢٠) بن و ل سينگ و پشتێ دنڤيسايبن.
- نابيت بتەرەكسۆتان يارىێ بكەت.
- نابيت چ تشت لبەربن كو ياريكەران توشی هنگافتنێ بكەت.
- دڤێت ياريكەر بەرچاڤكێن خۆ بكەتە چاڤێن خۆ وئەو بەر پرسيارە ژخۆ.

## مادده -٥- سەرۆكێن تيمێ: قادة الفرق

### ❖ كابتن: رئيس الفريق

كابتن و راهێنەر بەرپرسن ژ رابوون و رونشتن و رەوشتێ هەمی ياريكەران.

- نابيت ياريكەرێ بەرەڤانێ ئازاد (ليبرو) ببيتە كابتن.
- بەری يارىێ كابتن ئيمزايێ لسەر فۆرما يارىێ دكەت ودبيتە نوينەرێ تيما خۆ دپشك كێشانێدا.
- ئەگەر كاپتنێ تيمێ لدەمێ يارىێ هاتە گوهۆڕين دهەرگێمەكی دابيت دڤێت راهێنەر ياريكەرەكێ دی دەست نيشان بكەت بۆ كاپتنيێ.

### ❖ ڕاهێنەر: المدرب

ڕاهێنەردشێت هەمی رێنمايێن خۆ و خەلەتێن ياريكەران دروست بكەت بئاخفتنێ دگەل دادڤانێ ياريگەهێ.

- ڕاهێنەر ئيمزايێ لسەر فۆرما يارىێ دكەت بەری دەست پێكرنا يارىێ ودڤێت يێ پشت راست بيت لسەر ژمارە وناڤێن ياريكەران.
- بۆ ڕاهێنەری هەيە داخازا گوهۆڕين ودەمێن ڤەبری بكەت . وپێدڤيە بەری دەست پێكرنا هەر گێمەكی پسۆلا جھ و ژمارێن راوەستيانا ياريكەران بدەتە دادڤانێ دووێ.

### ❖ هاريكارێ راهێنەری : مساعد المدرب

هاريكارێ راهێنەری دروينتەخارێ ب ڕەخ ڕاهێنەريڤە وهيچ ماف نينە.

### مادده -٦- تۆمارکرنا خالەکێ وسەرکەفتن بگێمەکی ویاریێ : تسجيل نقطةوالفوز بالشوط والمباراة

❖ **خالێ:** تیم تۆماردکەت لدەمێ لە کاتی:

- تەپە بئەردێ یاریگەها تیما بەرامبەر بکەڤیت
- یان تیما بەرامبەر خەلەتیەکێ بکەت
- یان تیما بەرامبەر هوشداریێ وەربگریت
- تیما بەرامبەر هەر خەلەتیەکێ بکەت دژی یاسایێن ڤۆلی بۆلێ ئەڤەژی دادڤان دیاردکەن.

❖ **برنا گێمەکی: الفوز بالشوط**

ئەو تیما (٢٥) خالان تۆماربکەت ئەو دێ گێمی بەت بمەرجەکێ ب جوداهیا (٢) خالان وە (٢٥-٢٣).

- (٢٦-٢٤) (٢٧-٢٥) بەلێ لگێمێ پێنجێ ژ (١٥) خالان تمام دبیت هەر بهەمان شێوە ب جوداهیا ٢ خالان .

❖ **برنا یاریێ ( سەرکەفتن دیاریێ دا ) : الفوز بالمباراة**

- هەر تیمەکا (٣ گێما ببەت ئەو یاریێ دبەت).
- ئەگەر وەکهەڤی بوو (٢-٢) گێم دێ گێمێ ئێك لایی کرنێ هێتە ئەنجام دان ژ (١٥) خالا بدوماهی دهێت ب جوداهیا (٢ خالان).

### مادده -٧- شێوێ یاریێ : نظام اللعب

❖ **پشك کێشان : القرعة**

دادڤانێ ئێکێ پشك کێشانێ دکەت دناڤبەرا دوو کاپتنان دا داجهێ تیمان و سێرف لێدان وپێشوازیکرنا تەپێ دیاربکەت.

- یێ پشك کێشانێ ببەت . دێ هەلبژێریت:

1. یان لێدانا سێرڤێ یان پێشوازیا سێرڤی.
2. یان لایەکێ یاریگەهێ : لڤێرێ دادڤان هەلبژارتنا دی وردگریت.

❖ **گەرم کرن : الاحماء**

بەری یاریێ دادڤان ٦-١٠ خولەکان ددەتە هەردوو تیمان داکو گەرمکرنێ بکەن لسەر تۆرێ .

شەش یاریکەر ژهەرتیمەکێ دڤێت دناڤ یاریگەهێدا بن بەری سێرف لێدانێ.

❖ **خەلەتیا بنگەهی : خطأالمركز**

هەر تیمەك خەلەتیا بنگەهی دکەت ئەگەر یاریکەر لبنگەهێ خۆ نەبیت د دەمێ لێدانا سێرڤی دا.

❖ **زڤرین : دوران**

ئەگەر تیمەکێ مافێ سێرف لێدانێ وەرگرت یاریکەر ئێك بنگەهـ دێ زڤرن دگەل میلێ دەمژمێرێ.

## ❖ خەلەتیا زڤرینێ: خطأ دوران

تیم خەلەتیا زڤرینێ دکەت ئەگەر هات و سێرف لێدان لدویف زنجیرا زڤرینێ نەبیت . لڤێرێ سێرف دێ ژدەست چیت وجهێن یاریکەران دێ هێنە چاك كرن.

## مادده -٨- گوهۆڕینا یاریکەران: تبدیل اللاعبین

- ♦ هەر تیمەکێ مافێ گوهۆڕینا (٦) شەش یاریکەران هەیە دهەر گێمەکی د اژبلی یاریکەرێن (لیبرو) .
- ♦ بۆ هەیە یاریکەرێن بنەرەتی (سەرەکی) بگوهۆریت بیاریزانێن یەدەك وبزڤرینتە ناڤ یاریگەهێ بەلێ بۆ جهێ خۆ دگەل وی یاریکەرێ چوویە جهێ وی وئێك جار دهەر گێمەکی دا .

## ❖ گوهۆڕینا نەچاری: التبدیل الاستثنائی

ئەگەر یاریکەرەك توشی هنگافتنێ بوو دیارێ دا ونەشیا بەردەوامبیت دیاریکرنێ دا بۆ هەیە گوهۆڕین گوهۆڕینەکا یاسایی (ژبلی یاریکەرێ لیبرو) ئەگەر ئەڤە نەدشیاندابیت لڤێرێ گوهۆڕینا نەچاری دێ هێتەکرن دگەل هەر یاریکەرەکی ژبلی یاریکەرێ (لیبرو) نەبیت گوهۆڕینا (لیبرو) ژی.

## ❖ گوهۆڕین ب هۆکارێ دەرئێخستنێ ودویرکرنێ: التبدیل بسبب الطرد او الستبعاد

دڤێت یاریکەرێ دەرئێخستی یان دویرکری بهێتە گوهۆڕین ب گوهۆڕینەکا یاسایی ئەگەر نەدشیاندا بیت بریاردێ هێتەدان بنەتەمامیا تیمێ چونکی بهیچ شێوەکی نابیت تیم ب (٥) یاریکەرا یان کێمتر یاریێ بکەت بتنێ ب (٦) یاریکەران یاریێ دێ کەت.

## مادده -٩- لڤینێن یاریێ: حرکات اللعب

## ❖ تۆپە ل یاریێ: الكرة في اللعب

پشتێ لێدانا فیرکا دادڤانی بۆ لێدانا سێرڤی لدەمێ تەپە ژ دەستێ یاریکەری دەردکەڤیت بۆ لێدانا سێرڤی لوی دەمی تەپە یا دیاریێ دا.

## ❖ تە پە ژ دەرڤەی یاریێ: الكرة خارج اللعب

تەپە یا ژدەرڤەی یاریێ لوی دەمی خەلەتی روی ددەت ودادڤانێ ئێکێ یان دووێ فیرکێ لێ ددەت ، یان خەلەتیژی نەبیت لدەمێ فیرکا دادڤانی.

## ❖ تە پە ژناڤدا: الكرة داخل

لدەمێ تەپە ژئەردێ یاریگەهێ یان خیچێن ژدەرڤە بکەڤیت.

### ❖ تە پە ژدەرڤە : الكرة خارج

ئەگەر (اذا)

١. بتمامى بئەردێ ژدەرڤەی یاریگەهێ بکەڤیت.

٢. بلەشەکی ژدەرڤەی یاریگەهێ یان ، ب بانی ، یان بمرۆڤەکێ ژدەرڤەی یاریگەهێ.

٣. ب دو دارێن هەوائی یان ، ستوینگان یان ، تۆرێ ژدەرڤەی شریتێن تەنشتان.

٤. بتمامی دبن تۆرێ رابچیت.

### مادده -١٠- لێدانا تە پێ : ضربات الفريق

هەر تیمەکێ مافێ هەی (٣) سێ جاران لتەپێ بدەت (ژبلی بلۆکی).

### ❖ لێدانێن ئێك لدویف ئێك : اللمسات المتتالية

نابیت یاریکەر دوو جاران لسەر ئێك لتەپێ بدەت (ژبلی بلوکی).

### ❖ لێدانا دگەل ئێك : اللمسات المتزامنة

دبیت دوو یاریزان یان سێ دهەمان دەمدا لتەپێ بدەن.

### ❖ لێدانا هاریکار : الضربة المساعدة

نابیت یاریکەر دناڤ یاریگەهێدا هاریکارێ وەربگریت ژ هەڤالەکی یان ، ئاستەنگەکی یان ، لەشەکی کو بگەهیتە تەپێ.

### ❖ ساخلەتێن لێدانێ : خصائص الضربة

١. دبیت تەپە ژهەر جهەکی بگریت ژ لەشی .

٢. دڤێت تەپە بهێتەلێدان نەبهێتە گرتن یان هاڤێتن.

٣. دبیت تەپە بچەند پارچەکان بکەڤیت بمەرجەکی دهەمان دەمدابیت.

٤. لدەمێ بلۆك کرنێ دبیت یاریکەر یان یاریکەران چەند جار دەستێن خۆ لتەپێ بدەت بمەرجەکی ئێك لڤین بیت.

### تە پە لرەخێ تۆرێ : الكرة عند الشبكة

- دبیت تەپە لسەر تۆرێ لڤینێ بکەت ئەگەر ل سێرڤی بیت یان ددەمێ یاریکرنێ دا بیت.
- ئەگەر تەپە لدەمێ سێرڤی ، یان ددەمێ یاریکرنێدا بسەر رەخێ تۆرێ کەت ژ سەری ئەڤە یاری یا بەردەوامە.
- نابیت لدەمێ یاریێ یاریکەر پیێ خو بتمامی ل ئەردێ یاریگەها بەرامبەر بدەت.
- لدەمێ یاریێ ئەگەر تەپە بتۆرێ کەت و زڤری ل سنورێ (٣) لێدانان بیت ئەڤە دبیت.

- ئەگەر تەپە ب تۆڕێ کەت وکونێن تۆرێ دڕاندن یان تۆرکەت ئەڤ خالە ناهێتە هژمارتن وئەڤ خالە دێ هێتە دووبارەکرن.

## مادده -١١- یاریکەر لبەر تۆڕێ : اللاعب عند الشبكة

### ❖ گەهشتن بۆ پشت تۆرێ : الوصول خلف الشبكة

- لدەمێ بلۆك : ئەو یاریکەرێ بلۆکێ دکەت مافێ وی یێ هەی دەستی لتەپێ بدەت لپشت تۆرێ بمەرجەکی تێکەل نەبیت دگەل یاریا تیما بەرامبەر ولدەمێ لێدانا هێرشێ یا دوماهیێ یان پشتی هێرشێ بۆ یاریکەرێ بەرامبەر.
- دبیت یاریکەر دەستێ خۆ درێژکەتە پشت تۆرێ بمەرجەکی لێدان دبوارێ یاریا ویدابیت.
- نابیت یاریکەر پێیەکی ، یان هەردوکان لئەردێ یاریگەها بەرامبەر بدەت ددەمێ یاریێ دا.
- دبیت یاریکەر ب پییەکی وی ، یان هەردووکان بئەردێ تیما بەرامبەر بکەڤیت بمەرجەکی بەشەك ژ پێیێ دەرباکری یان دوو پیێ ئێکسەر لسەر خیچی بیت .
- دبیت یاریکەر بچیتە ناڤ یاریگەها تیما بەرامبەر پشتی تەپە دچیتە ژ دەرڤەی یاریێ.
- خەلەتی نینە ئەگەر تەپە بتۆڕێ کەت وتۆر چو پشتێ وبیاریکەری کەت.

## مادده -١٢- سێرڤ: الارسال

- ئەو لڤینە یا کو تەپە دهێتە دانان دناڤ یاریێ دا بهۆکارێ یاریکەرێ دەستێ راستێ ژ دەرڤەی دەڤەرا سێرڤێ .
- ئێکەم سێرف لگێمێ ئێکێ هەروەسا لگێمێ پێنجێ بووێ تیما کو پشك كێشانێ دیارکری.
- لگێمێ دووێ ئەو تیما لگێمێ ئێکێ سێرف لێنەدای سێرڤی دێ لێدەت وبنوبە دێ هێتە لێدان تاکو دگەهتە گێمێ پێنجێ (دڤێت سێرف دناڤ بەرا (٨) چرکاندا بهێتە لێدان ).
- دڤێت یاریکەر ئێك لدویف ئێك سێرڤی لێبدەن لدویف وێ پسولا رێککستنێ یازڤرینێ ودێ زڤرن لدویف میلێ دەمژمێرێ.
- ئەگەر ئەو تیما سێرف لێدای وخال بری سێرڤێ دووێ هەمان یاریکەر دێ لێدەت یان ئەو یاریکەرێ دێ دگەل هێتە گوهۆڕین.
- ئەگەر تیما بەرامبەر سێرف بر . دێ مافێ لێدانا سێرڤی هەبیت ، ودێ زڤرن بەری لێدانا سێرڤی . وئەو یاریکەرێ لبنکێ راستێ پێشیێ دێ چیتە بنکێ دوماهیێ یێ راستێ . سێرڤی دێ لێدەت.
- سێرف بئێك دەست دێ هێتە لێدان . نابیت بسەری یان پێی یان بدوو دەستان لێبدەت . دبیت بپێشی دەستێ یاریکەری سێرڤی دەرچیت وبدەستێ دووێ بهێتە لێدان.

## ❖ خەلەتیێن سێرڤی: اخطاء الارسال

لدەمێ سێرف لێدانێ

١. ئەگەر ئێك لدویف ئێك نەهێتە لێدان.

٢. ئەگەر بشێوەكێ دروست نەهێتە لێدان:

أ– پێ وی لسەر خیچا دوماهیێ بیت.

ب– تەپە ژدەستی دەرنەكەڤیت.

ت– (٨) چركان زێدەتر ڤەگریت.

پ– بدوو دەستان بهێتە لێدان.

ج– تەپە بهێتە لێدان یان تەپە بهێتە هاڤێژتن.

ح– بسەری بهێتە لێدان.

خ– ل جهێ سێرف لێدانێ نەهێتە لێدان.

## ❖ خەلەتێن پشتی سێرڤ لێدانێ:

سێرف دێ ب خەلەتی هێتە دانان ئەگەر

أ– یاریكەرەكێ تیما سێرف لێدەر بكەڤیت.

ب– ل بوارێ سەر تۆڕێ ئاڤاكرن ئەگەر تەپە نەچیت.

ت– سێرف بچیتە ژ دەرڤەی یاریگەهێ.

پ– ئەگەر ئاڤابوو لسەر ڤەشارتنا سێرڤی .

ج– ل هەوای تەپەببانی بكەڤیت یان بهەر لەشەكی دی بكەڤیت.

### ماددە -١٣- لێدانا هێرش كرنێ: الضربة الهجومية

هەر لڤینەك بۆ ئاراستەكرنا تەپێ بۆ یاریگەها بەرامبەر لێدانا هێرش كرنێ یە (بتنێ سێرف وبلوك كرن نەبیت).

♦ دبیت بەردانا تەپێ لدەمێ لێدانا هێرش كرنێ بمەرجەكی ئەگەر لێدان یا دیاربیت وتەپە نەهێتەگرتن ونەهێنە هاڤێتن.

## ❖ كرێیێن لێدانا هێرش كرنێ : قيود الضربة الهجومية

أ– یاریكەرێن ڕێزا پێشیێ ماف هەیە رابن بلێدانا هێرش كرنێ یان تەپێ دەربازبكەن بۆ یاریگەها بەرامبەر لسەر هەر بلنداهیەكێ بمەرجەكی هێرش بهێتە بجهـ ئینان دناڤ یاریگەها خۆدا.

ب– یاریكەرێن ڕێزا پاشیێ ماف هەیە بلێدانا هێرش كرنێ بكاربینن لسەر هەر بلندیەكێ بیت بمەرجەكی لدوماهیا دەڤەرا پێشێ بیت ونابیت پیێ (هەردوو پێ) پێن یاریكەرێ هێرش بەر لسەر خیچا هێرش كرنێ بن بەلێ دبیت پشتی لێدانا هێرش كرنێ بهێنە خوارێ لدەڤەرا پێشیێ.

ت- نابیت یاریکەرێ (لیبرو) لێدانا هێرش کرنێ بۆ هیچ دەڤەرەکێ بکەت و نابیت یاریکەرێ (لیبرو) ئەو تەپا بلند دکەت ب تبلێن خۆ لدەڤەرا پێشییێ هێرش بکەت.

### مادده -١٤- بلۆك : ( الصد )

### ❖ بلۆك کرن :

ئەو لڤینا یاریکەرێن نێزیکێ تۆرێ یە بۆ زڤراندنا وێ تەپا ژلاییێ یاریکەرێن بەرامبەر دهێت ئەوژی ئەوە کو یاریکەرێن بەرەڤان بلندبن بۆ بلندترین جهێ لسەر ئاستێ لسەرێ تۆرێ بلۆکی بکەن.

یاریکەرێن رێزا پێشییێ بتنێ مافێ بلۆك کرنێ یێ هەی.

### ❖ هەولا بلۆك کرنێ: ( محاولة الصد )

ئەو ژی هەولا بلۆك کرنێ یە بێی کو یاریکەر دەستێ خۆلتەپێ بدەت.

### ❖ بلۆك کرنا تمام: ( الصد المکتمل )

بلۆك کرن تمام دبیت ئەگەر دەستێ یاریکەری بتەپێ کەت.

### ❖ بلۆك کرنا بکۆم: ( الصد الجماعي )

دهێتە بجهئینان ئەگەر دوو یاریکەر یان سێ نێزیکێ ئێك بن و رابن پێکڤە بلوکێ بکەن وتمام دبیت ئەگەر تەپە بدەستێ ئێك ژوان هەر سێ یاریکەران کەڤیت.

### ❖ بلۆك کرنا سێرڤی : ( صد الارسال )

نابیت سێرڤێ تیما بەرامبەر بهێتە بلۆك کرن.

### ❖ دەست کرنا بلۆکی : ( لمسة الصد )

یاریکەری مافێ هەی ئەگەر چەندین جاران تەپە بدەستی بکەڤیت لدویف ئێك بمەرجەکی ئەو بدەست کەتنە روی بدەت لدەمێ ئێك لڤین بیت.

### ❖ بلۆك کرن ولێدانێن تیمێ : ( الصد و ضربات الفريق )

دەست کرنا تەپێ لدەمێ بلۆکی دا ناهێتە هژمارتن لێدانا تەپێ . لەوا هەر تیمەکێ مافێ هەی پشتی دەست کرنا تەپێ پشتی بلۆك کرنێ و (٣) سێ جار لتەپێ بدەت بو وێ چەندێ کو تەپێ بزڤرینتە یاریگەها تیما بەرامبەر.

- نابیت یاریکەرێن هێلا پاشییێ ویاریکەرێ (لیبرو) بلۆکێ بکەن ، یان بەشدارییێ دبلۆك کرنێدا بکەن بکۆم وتمام .

### ❖ بلۆك كرنا ژناڤدا یا یاریگەها بەرامبەر: ( الصد داخل مجال المنافس )

یاریکەری مافێ هەی لدەمێ بلۆك کرنێ دەستێن خۆ درێژ کەتە پشت تۆرێ بۆ ناڤ یاریگەها تیما بەرامبەر بمەرجەکی تێکەلی لڤینێن تیما بەرامبەر نەبیت و ئەو نابیت دەستێ خۆ لتەپێ بدەت لپشت تۆرێ تەنها بتنێ تیما بەرامبەر لێدانا خۆ یا هێرش برنێ بجهـ دئینیت.

- ◆ نابیت یاریکەرێن هێلا پاشیێ ویاریکەرێ (لیبرو) بلۆکێ بکەن ، یان بەشداریێ دبلۆك کرنێدا بکەن بکۆم وتمام.

### ماده -١٥- راوەستیان و پاشئێخستن: ( التوقفات و التأخیرات )

- ◆ ژمارا راوەستیانێت نۆرمال هەر تیمەکێ مافێ (٢) دەمێن ڤەبرِی یێ هەی دگەل (٦) شەش گوهۆرِینان دهەر گێمەکی دا.
- ◆ داخازیا راوەستیانێن نۆرمال دڤێت درێکا راهێنەریدا بیت وداخازی دهێتەکرن بدەربرینا هێمایێ دەستی لدەمێ تەپە ژدەرڤەی یاریێ دا بیت وبەری فیرکا دادڤانی بۆ لێدانا سێرڤی.
- ◆ دڤێت راهێنەر یاریکەری بهنێرتە دەڤەرا گوهۆرِینێ بۆ ئەنجام دانا گوهۆرِینێ ودڤێت بهێتە تومارکرن بگوهۆرِینێن یاسایی دگێمی دا.

### ❖ راوەستیانێن ئێك لدویڤ ئێكێ: ( التوقفات المتتالیة )

هەر تیمەکێ مافێ هەی کو دوو دەمێن ڤەبرِی وئێك گوهۆرِین داخاز کەت دهەمان راوەستیاندا بەری کو یاری دەست پێ بکەت.

- ◆ نابیت تیم داخازا گوهۆرِینێ ئێك لدویف ئێك بکەن د هەمان راوەستیانا ڤەبرِی ، دا بەلێ تیمێ مافێ هەی دوو یاریکەران ، یان زێدەتر بگوهۆریت دهەمان راوەستیان دا پشتی داخازیێ بۆ گوهۆرِینێ.

### ❖ دەمێن ڤەبری :( الاوقات المستقطعة )

هەر دەمەکێ ڤەبری ٣٠ چرکان ڤەدکێشیت.

### ❖ دەمێن ڤەبرِی یێن هونەری: ( الاوقات المستقطعة الفنیة )

بۆ یاریێن ئاستێ وان گەلەك بلند وئەو یاریێن ئێکەتیا ڤۆلی بۆلێ یا دەولەتی سەرپەرشتیا وان دکەت لگێمێ (١ - ٤) دوو دەمێن ڤەبرِی یێن هونەری یێن هەین دهێنە پەیرەوکرن ئوتوماتیکی وماوێ هەر ئێکی (٦٠) چرکەنە لدەمێ تیم یا پێشکەفتی ودگەهتە خالا (١٦،٨) ٠ بەلێ کێمێ پێنجێ دەمێن ڤەبرِی یێن هونەری نینن وناهێنە پەیرەوکرن چونکی ل خالا (١٥) گێم بدوماهی دهێت . بەلێ دوو دەمێن ڤەبری یێن هەین بۆ هەر تیمەکا داخاز کەت وماوێ وان (٣٠) چرکە نە.

- ◆ لدەمێ ڤەبری دڤێت یاریکەر بچنە ژدەرڤەی یاریگەهێ بۆ دەڤەرا ئازاد لدەف کورسیکێن یەدەکان.

### ❖ گوهۆڕینا یاریکەران : ( تبديل لاعب )

- ◆ دڤێت گوهۆڕین لدەڤەرا گوهۆڕینان بهێتە کرن.
- ◆ گوهۆڕینا یاریکەران چ دەم نینن هەر هند دێ ڤەکێشیت کو یاریکەرەك دەرکەڤیت یاریکەرەکێ دی بچیتە ناڤ یاریگەهێ وتۆمارکرنا وێ گوهۆڕینێ.
- ◆ دڤێت یاریکەرێ گوهۆڕ (یان یاریکەران) لدەمێ داخازیا گوهۆڕینێ ئامادەبن بۆ چونا ژور دناڤ یاریگەهێ دا لدەڤەرا گوهۆڕینێ.
- ◆ ئەگەر یاریکەر ئامادەنەبیت لدەڤەرا گوهۆڕینێ لدەمێ داخازکرنا گوهۆڕینێ گوهۆڕین دێ هێتە قەدەغەکرن وتیم دێ هێتە سزادان بگیروکرنا یاریێ .
- ◆ یارییێن ئاست بەرز بو ردێ گوهۆڕینێ بنمرە بکاردهێت بو ئاسانکرنا گوهۆڕینێ.

### مادده -١٦- گیرۆکرنێن یاریێ : ( تأخيرات اللعب )

❖ هەر هەلویستەکێ خەلەت بۆ گیرۆکرنێ دەست پێ دکەت وەکو:

- ◆ گیرۆکرنا گوهۆڕینا یاریکەران.
- ◆ درێژە پێدانێن ڕاوەستیانێن دی پشتی کو داخاز لێ دهێتەکرن دەست ب یاریێ .
- ◆ داخازیا گوهۆڕینا نەیاسایی .
- ◆ دووبارە داخازا گوهۆڕینەکا خەلەت .
- ◆ گیروکرنا یاریێ ب ڕێکا ئەندامەکێ تیمێ.

### ❖ سزایێن گیرۆکرنێ : ( جزاءات التأخيرات )

- ◆ دڤێت یاری گیرۆکرن سزایێ (بالكێشیێ) گیرۆکرنێ بدەنێ .
- ◆ بۆجارا دووێ یاری گیرۆکرن ئاگەهدارکرنا گیرۆکرنێ بدەنە تیمێ (ئەو ژی بسزایێ وێ دێ بسێرڤی خوسارەتبیت). وخالەك بۆ تیما بەرامبەر هێتە نڤیسان.
- ◆ ئەڤ سزایە بەردەوام دمینت هەتا کو یاری بدوماهی دهێت.
- ◆ هەمی سزابەری دەست پێکرنا یاریێ یان دنیڤا گێماندا لگێمێ باشتر دهێتە تۆمارکرن.

### مادده -١٧- راوەستانێن یاریێ بێن ژبلی : ( توقفات اللعب الاستثنائية )

### ❖ هنگاڤتن : الاصابة

ئەگەر روویدانەکا ترسناك روی دا لدەمێ یاریێ وتەپە ژی دیاریێ دا بوو .دڤێت دادڤان ئێکسەر یاریێ راگریت ورێ بدەتە نوژداری بهێتە ناڤ یاریگەهێ بۆ چارەکرنا یاریکەری . پاشی وێ خالێ دێ دوبارەکەت.

♦ ئەگەر گوهۆڕینا یاریکەران هات وبشێوەکێ یاسایی یان نەهاتە کرن دێ (٣) خولەك هێنە دان بۆ یاریکەری بۆ چارەسەرکرنکێ بەلێ نابیت ژ چارەکێ پتر بهێتە دان بۆ یاریکەری .
ئەگەر نەهاتەچارەکرن ئاگەهداری دهێتە کرن بتەمامەتیا تیمێ.

### ❖ کارتێکرنێن دەرەکی : ( التدخل الخارجي )

ئەگەر هەر کارتێکرنەکا دەرەکی ڕویدا لدەمێ یاریێ یاری دێ راوستیت وخال ناهێتە دوبارەکرن.

### ❖ ڕاوەستیانێن درێژ : ( التوقفات المطولة )

ئەگەر ڕویدانەکا تەنگا ڤیان لدەمێ یاریێ رویدا دڤێت یاری بڕاوەستیت و دڤێت دادڤانێ ئێکێ و لیژنا چاڤدێر و سەرپەرشتێ یاریێ بکەت هەر تشتەك ڤەگەڕیتە ئاستێ خۆ یێ سرۆشتی.

♦ ئەگەر هەر راوەستیانەك روی بدەت دڤێت سەرجەم هەمی (٤) دەم ژمێران نەڤەکێشیت:-

أ- ئەگەر لهەمان یاریگەە دەست پێ بکەت کێم دێ بەردەوام بیت بشێوەکێ ئاسایی بهەمان ئەنجام وياریکەر ودەڤەرێن وان • وئەنجامێ گێمان بەری یاریێ دێ وەکو خۆمینت.

ب- ئەگەر یاری هاتە ڤەگوهاستن بۆ یاریگەهـ کا دی ئەو گێمێ تێدا یاری هاتیە راوەستیان دێ هێتە هەلوەشاندن ودووبارە گێم دێ هێتە دەست پێ کرن بهەمان ئەندامێن تیمێ وهەمان راوەستیانا دەڤەرێن یاریکەران یابنەرەتی (سەرەکی) وئەنجامی گێمێن دی دێ وەکی خۆمینن.

ت- ئەگەر راوەستانەك روودا یان چەند راوەستان بۆ دەمێ زیدەتر ژ (٤) دەمژمیرا. دڤیت ئەو یاریە دوبارە بیت. (تعاد المبارة بالكامل).

### ماددە -١٨- ماوێ بێهنڤەدانێ وگوهۆڕینا یاریکەران : فترات الراحة و تغير الملاعب

♦ ماوێ بێهن ڤەدانێ دناڤ بەرا هەمی گێماندا (٣) سێ خولەکن دڤی دەمیدا دڤێت یاریگەهـ بهێتە گورهاتن وزنجیرا زڤرینێ بهێتە تومارکرن بۆ هەردوو تیمان دفورما تۆمارکرنێدا.

### ❖ گۆهۆرینا یاریگەهان : تغيير الملاعب

تیم دێ یاریگەهێن خۆ گوهۆرن پشتی تمام بوونا هەرگێمەکی بتنێ گێمێ پێنجێ نەبیت پشتی تمام بوونا گێمێ چارێ ئەگەر ئەنجام دوو گێم بوو هەردوو تیما بیت ، دڤێت دادڤانێ ئێکێ پشك کێشانێ بکەت بۆ دیارکرنا یاریگەها هەردوو تیمان وسێرڤ لێدەر وپێشوازیا لتەپێ کرن.

♦ ژ گێمێ پێنجێ ژوی دەمێ هەرتیمەك دگەهیتە خالا (٨) هەشتێ دڤێت هەردوو تیم بێی گیرۆکرن یاریگەهێن خۆ بگوهۆرن بەلێ دەڤەرێن یاریکەران وەکو خو دمینن.

### مادده -١٩-یاریکەرێ بەرەڤانێ ئازاد ( لیبرو ): اللاعب المدافع الحر

- هەر تیمەکێ مافێ هەی یاریکەرەکی (١) تۆماربکەت وەکو یاریکەرێ بەرەڤانێ ئازاد (لیبرو) د لیستا (١٢) یاریکەراندا.
- دڤێت یاریکەرێ بەرەڤانێ ئازاد بهێتە تۆمارکرن دفۆرما یا بێ دا پێش دەستپێکا یاریێ لجهێ تایبەتێ دیارکری بوی . ودڤێت ژمارا یاریکەرێ (لیبرو) بهێتە نڤیسان دکاغەزا زنجیرا زڤرینێدا هەر پێنج گێمان وبەروڤاژی راهێنەر نەشێت یاریێ پێ بکەت.
- نابیت یاریکەرێ بەرەڤانێ ئازاد کابتن بیت ونابیت ببیتە سەرۆکێ گێمی ئەگەر کابتن بچیتە ژدەرڤە وبهێتە گوهۆرین دگەل یاریکەرەکێ دی.
- دڤێت یاریکەرێ بەرەڤانێ ئازاد تیشێرتێ وێ یێ جێواز بیت دگەل یاریکەرێن دی بەلێ دڤێت ژمارە لسەر هەبیت وەکو یاریکەرێن دی.

### ❖ لڤینا یاریکەرێ لیبرو :الحرکات المسموحة للیبرو

#### لڤینا یاریێ : حرکات اللعب

- یاریکەرێ لیبرو دشێت خۆبگوهۆریت دگەل هەر یاریکەرەکێ رێزا پاشیێ .
- دڤێت وەکو یاریکەرەکێ پاشیێ یاریێ بکەت ونابیت هێرشان بکەت یان پەستانێ بکەت لهەر دەڤەرەکێ بیت لپێشیێ یان پاشیێ یان دەڤەرا ئازاد.
- نابیت سێرڤی لێبدەت یان بلۆکێ بکەت یان هەولدانا بلوکێ بکەت.
- یاریکەری ماف نینە تەپێ پەستان بکەت ئەگەر ژئاستێ سەرێ تۆرێ یا یاریکەرێ لیبروی بتبلێن خۆ تەپە بلندکربیت لدەڤەرا پێشیێ بۆ هێرش کرنێ یان پەستانێ.

بەلێ مافێ هەی بتبلێن خۆ تەپێ بلندکەت بۆ هێرش کرنێ لدەڤەرا پاشیێ.

- ❖ گوهۆرینا یاریکەرێ بەرەڤانێ ئازاد ناهێتە هژمارتن بگوهۆرینەکا یاسایی یا نۆرمال گوهۆرینان سنور نینە بەلێ هەکەر هاتە ژدەرڤەی یاریێ دڤێت خالەك بسەرڤە بچیت ئەو خال بۆ کیش تیمێ بیت دشێت بهێتە ناڤ یاریگەهێ.
- ❖ گوهۆرین دهێتە بجهـ ئینان لدەمێ تەپە ژدەرڤە بیت.
- ❖ ل دەستپێکا هەر گێمەکی (لیبرو) نەشێت بچیتە دناڤ یاریگەهێ دا تاکو دادڤانێ دووێ ووردبینێ لسەر کاغەزا زنجیرا راوەستیانا بنەرەت یا یاریکەرا دکەت.
- ❖ گوهۆرینا (لیبرو) ناهێتە رەت کرن پشتی فیرکا دادڤانی بۆ لێدانا سێرڤی بەلێ پێش لێدانا سێرڤی سەرنج راکێشانا (زارەکی) دێ وەرگریت ژلایێ دادڤانی ڤە پشتی بدوماهیك هاتنا خالەکێ پشتی دووبارە دکەت دێ سزایێ دویرئێخستنێ وەرگریت.

❖ یاریکەرێ (لیبرو) گوهۆڕینێ دکەت لخیچا تەنشتێ بەرامبەر جهێ رونشتنا یاریکەرێن یەدەك دناڤبەرا خیچا هێرش برنێ وخیچا دوماهیێ.

❖ **دووباره دەستنیشان کرنا یاریکەرێ بەرەڤانێ ئازاد : اعادة تعيين لاعب المدفع الحر**

لدەمێ هنگافتنا یاریکەرێ بەرەڤانێ ئازاد (لیبرو) برازیبوونا دادڤانێ ئێکێ راهێنەر دشێت یاریکەرەکێ دی دەست نیشان بکەت بۆ (لیبرو) ژوان یاریکەران ئەوێن دناڤ یاریگەهێ دا نەبن (یەدەك) بەلێ ئەو یاریکەرێ توشی هنگافتنێ بووی نابیت ڤەگەریتە ناڤ یاریگەهێ وببیتە لیبرو.

❖ دڤێت ئەو یاریکەرێ نوی هاتیە دەست نیشانکرن بۆ لیبرو بمینیت لیبرو تاکو ب دوماهیی هاتنا یاریێ.

## ماددە -٢٠- رەوشتێ بەشداربویان : ( سلوك المشاركين )

### رەوشتێ وەرزشی وەرزشی : ( سلوك الرياضي )

◆ دڤێت هەمی بەشداربوو یاسایا فەرمی یا ڤۆلی بۆلێ بزانن وبکاربینن.

◆ دڤێت هەمی بەشداربوو رازی ببن ل بریارێن دادڤانی . ئەگەر کاپتنی گۆمان لسەر تشتەکی هەبیت دڤێت دادڤان بۆ روون کەت .

◆ دڤێت هەمی بەشداربوو دویرکەڤن ژ لڤینێت نەشرین کو کارتێکرنێ بکەن لسەر بریارێن دادڤانی یان خەلەتێن تیما خۆ پێ بڤە شێرن.

## ماددە -٢١- رەوشتێ نەباش وسزایێن وی : ( سوء السلوك و جزاءاته )

### ❖ رەوشتێ نەباش یێ بساناهی : سوء السلوك البسيط

رەوشتێ نەباش یێ بساناهی وەناگەت ئەندامێن تیمێ توشی سزایێن دژواربین بەلێ دادڤانێ ئێکێ دشێت سەرنج راکێشانێ بدەتێ درێکا کابتنێ تیمێ دا.

### ❖ خشتێ سزایان : ( جدول الجزاء )

لدویف دادڤانێ ئێکێ وئاستێ ترسناکیا هەلویست سێ جۆرن :-

◆ **ئاگەهدارکرن : الانذار {کارتا زەر}**

بۆ رەوشتێ نەپەروەردەیێ ئیکێ دیاریێ دا ژلایێ هەر ئەندامەکێ تیمێ ڤە وسزایێ ویژی تەپە دێ هێتە ستاندن وخالەك دێ هێتەدان بۆ تیما بەرامبەر.

◆ **دەرئێخستن : الطرد {کارتا سور}**

نابیت ئەندامێ تیمێ یێ دەرئێخستی یاریێ بکەت تاکو گێم بدوماهی دهێت . ودڤێت رونین لدەڤەرا سزای بێی هیچ ئەنجامێن دی ئەگەر قەسێن نەشرین یان لڤینێن خراب بکارئینان .

♦ دویرئێخستن : ( الاستبعاد ) {كارتا سور و زەر پێكڤە}

دڤێت ئەو ئەندام بهێتە دویرئێخستن بۆ ژدەرڤەی یاریگەهێ تاكو یاری بدوماهیك دهێت بێی هیچ ئەنجام كێ دی.

❖ ئەگەر ژ لایێ هەر ئەندامەكێ تیمێ ڤەرەوشتەكێ خراب رویدا سزایێ خۆ دێ وەرگریت بەری یاری دەست پێ بكەت یان دناڤ بەرا گێماندا دێ دگێمێ دا هاتیدا هێتە بجهـ ئینان.

## مادده -٢٢- دەستەكا دادڤانان : ( هیئة التحكیم )

دەستەكا دادڤانان یا یاریێ پێك دهێت بفەرمی ژڤانێن داهاتی:

– دادڤانێ ئێكێ
– دادڤانێ دووێ
– نڤیسەر (دیاریێن دەولەتی دا دڤێت هاریكار هەبیت)
– دوو چاڤدیرانێن هێلا.

❖ دادڤانێ ئێكێ و دووێ بتنێ مافێ هەی فیركێ لێبدەن لدەمێ یاریێ دا.

❖ ئەگەر دادڤانێ ئێكێ فیرك لێدا لسەر خەلەتیەكێ دڤێت ئاماژێ بدەتە ڤان تشتێن لخوارێ:

– ئەو تیما دێ سێرڤێ لێدەت.
– جۆرێ خەلەتیێ
– ئەو یاریكەرێ خەلەتی كری (ئەگەر پێدڤی بیت)

پاشان دادڤانێ دووێ ئاماژێن دادڤانێ ئێكێ دوبارە دكەت.

❖ ئەگەر دادڤانێ دووێ فیرك لێدا لسەر خەلەتیەكێ دڤێت ئاماژێ بكەت بۆ:

– جۆرێ خەلەتیێ
– ئەو یاریكەرێ خەلەتی كری (ئەگەر پێتڤی بیت)
– دووبارەكرنا ئاماژێن دادڤانێ ئێكێ بووێ تیما دێ سێرڤی لێدەت.

## مادده -٢٣- دادڤانێ ئێكێ : ( الحكم الاول )

### بەرپرسایەتێن وی :( المسؤولیات )

❖ دادڤانێ ئێكێ رادبیتە پێش یاریێ :

– پشكنینا چەوانیا دەڤەرێن یاریێ وتورێ وتەپێ
– بجهـئینانا پشك كێشانێ دناڤبەرا دوو كابتناندا
– دادڤانێ ئێكێ بتنێ مافێ هەی ددەمێ یاریێ دا :

سزادانا سەرنج راكێشانێ بدەتە هەردوو تیمان وسزادانا هەلویستێ نەشرین وخراب ودویرئێخستنێ.

❖ و هەروەسا بریارێ ددەت لسەر:

أ– خەلەتیێن سێرف لێدانێ ودەڤەرێن تیما سێرف لێدەر ودگەل ڤەشارتنا سێرڤی.

ب– خەلەتێن یاریا تەپێ.

ت– خەلەتێن لسەر تۆرێ وپارچا سەرێ تۆرێ.

پ– لێدانا هێرش برنێ بۆ یاریکەرێ (لیبرو) ولێدانێن هێرش برنێ بۆیاریکەرێن رێزا پشتێ.

ج– ئاڤا بوونا تەپێ لژێر تۆرێ.

❖ لێدانا (پەستان) ژیاریکەرەکی ئەگەر تەپە بتبلا هاتبیتە بلندکرن ژدەڤەرا پێشیێ ژلایێ یاریکەرێ (لیبرو) ڤە.

❖ پشیێ بدوماهیك هاتنا یاریێ . ووردبینیێ لسەر فورما یاریێ دکەت وئیمزا دکەت.

## مادده -٢٤- دادڤانێ دووێ: ( الحكم الثاني )

### ❖ جه : ( الموقع )

دادڤانێ دووێ دێ ئەرکێن خۆ بجهـ ئینیت براوەستیان ژدەرڤەی یاریگەهێ نێزیکی ستوینا بەرامبەر دادڤانێ ئێکێ .

### ❖ دەست هەلات: ( السلطة )

◆ مافێ هەی ئاماژێ بکەت بێی فیرکێ لێبدەت بۆ خەلەتێن ژدەرڤە دەست هەلاتێ وی ، بەلێ ماف نینە رژدبیت سەر بەرامبەری دادڤانێ ئێکێ .

◆ چاڤدێریا کارێ نڤیسەری یان نڤیسەران دکەت.

◆ سەرپەرشتیا ئەندامێن هەردوو تیپا ل سەر جهی دانشتنێ و ئاگەهداریا دادڤانێ ئێکێ دکەت ل کێم و کاسییا.

◆ رازیبونێ دەردبریت بۆ راوەستانا یاریێ وچاڤدێریا وەختی دکەت . وداخازیێن خەلەت رەد دکەت وهەروەسا چاڤدێریا دەڤەرا سزایێ دکەت .

◆ چاڤدێریا یاریکەرا دکەت ل ناڤ جهێ گەرمبونێ.

◆ رازیبونێ دەردبریت بۆ راوەستانا یاریێ وچاڤدێریا وەختی دکەت . وداخازیێن خەلەت رەد دکەت وهەروەسا چاڤدێریا دەڤەرا سزایێ دکەت .

❖ چاڤدێریا دەمێن ڤەبری دکەت وگوهۆرینێن هەردوو تیمان وئاگەهداریا دادڤانێ ئێکێ وراهێنەران دکەت پاش دەمێ ڤەبریێ دووێ وگوهۆرینا پێنجێ وشەشێ .

❖ رێ ددەت لدەمێ هنگافتنێ بگوهۆرینا یاسایی یان (استثنائي) یان (٣) سێ خولەکان بدەنە بۆ چارەکرنان ئەگەر تیمێ یاریکەرێن یەدەك نەبن .

### بەرپرسایەتێن دادڤانێ دووێ : ( المسؤوليات )

- ♦ دێ پشتراست بیت ژجهـ ودەڤەرێن یاریکەران دناڤ یاریگەهێ دا بەری دەست پێکرن هەر گێمەکی لدویف کاغەزا زنجیرا زڤرینێ .
- ♦ بریارێ ددەت لدەمێ یاریێ وفیرکێ لێددەت.
- – بۆرینا پێ یان پێیێن یاریکەران لدەمێ یاریێ بۆ یاریگەها تیما بەرامبەر لژێر تۆرێ.
- – خەلەتێن دەڤەرا بۆ وێ تیما پێشوازیا تەپێ دکەت .
- – خەلەتێن بتۆرێ دکەڤن بشەریتا سپی یا سەری یان راکێشانا تۆرێ ب یان دارێ هەوائی بۆ لایێ خۆ .
- – هەر بلوك کرنەکا تمام برێکا یاریکەرێ دەڤەرا پاشیێ یان هەولدان بۆ بلوك کرنێ ژلایێ یاریکەرێ بەرەڤانێ ئازاد (لیبرو).
- – کەتنا تەپێ ب لەشەکی یان ئەردی لجهەکێ کو دادڤانێ ئێکێ نەشێت ببینیت .
- – پشتی یاریێ ئیمزایێ لسەر فۆرما یاریێ دکەت .

### ماددە -٢٥- نڤیسەر تۆمارکەر : ( المسجل )

#### ❖ جهـ : ( الموقع )

کارێ خۆ دکەت ب روینشتی پشت مێزا تۆمارکەری ل ڕەخێ دادڤانێ دووێ بەرامبەری دادڤانێ ئێکێ.

#### ❖ بەرپرسایەتێن دی : ( المسؤوليات )

- – بەری یاریێ رادبیت بنڤیسینا وزانیاری وناڤێن یاریکەران وژمارێن وان وراهێنەران ..... هتد

هەروەسا ئیمزایا راهێنەری وکابتنێ وەردگریت .

- – نڤیسینا زنجیرا بنەرەتیا یاریکەران یێن هەر تیمەکێ لدویف کاغەزا زنجیرا زڤرینێ دێ ژ راهێنەری وەرگریت .
- – نڤیسینا ژمارە وناڤێ یاریکەرێ بەرەڤانێ ئازاد (لیبرو).

#### ❖ لدەمێ یاریێ تۆمارکەر رادبیت بـ :

- – نڤیسینا خالان وەکو وەردگریت وپشت راست بونێ دکەت دگەل بۆردێ ئەنجامێ کا بتمامی نڤیسایە .
- – چاڤدێریا زنجیرا سێرف لێدانا بۆ هەردوو تیمان وئاماژێ دکەت بۆ ناڤێ هەردوو دادڤانان ئێکسەر بهەر خەلەتیەکا رووی بدەت پشتی لێدانا سێرڤی .
- – نڤیسینا دەمێن ڤەبری وگوهۆڕینێن یاریکەران وچاڤدێریا ژمارێن وان وئاگەهداریا دادڤانێ دووێ دکەت .
- – راگەهاندن بدادڤانان لسەر هەر داواکاریەکا نەیاسایی بیت .

- ڕاگەهاندن ب دادڤانان بۆ بدوماهیك هاتنا گێمان وبدوماهیك هاتنا هەر دەمەکێ ڤەبری یێ هونەری(٨ -١٦) خال و گەهشتنا هەر تیمەکێ بۆ خالا (٨) هەشتێ ل گێمێ پێنجێ .
- نڤیسینا هەمی سزایان .
- نڤیسینا هەر پێزانینەکێ و رویدانەکێ لدویف رێنمایان بریکا دادڤانێ دووێ وەکی گوهۆڕین ودەمێ چارەسەریێ وراوەستیانا یاریێ بۆ ماوەکێ درێژ. چونا (کارەبێ) . هاتنە ژورا جەماوەری بۆ ناف یاریگەهێ ..... هتد.
- نڤیسینا ئەنجامێ یاریێ و ئیمزاکرن.

## مادده -٢٦- هاریکارێ تۆمارکەری : ( مساعد المسجل )

❖ جه ( الموقع ) : کارێن خۆ ئەنجام ددەت ب روینشتی تەنشت تۆمارکەری پشت مێزا تۆمارکەری.

❖ **بەرپرسایەتێن وی ( المسؤولیات ) : .**

أ) هەمی گوهۆڕینێن یاریکەرێ بەرەڤانێ ئازاد (لیبرو) دنڤیسیت .

ب) هاریکاریا تۆمارکەری دەکەت دکار و برێڤەبرنا یاریێ دا .

ج) ئەگەر تۆمارکەر نەشیا بەردەوامیێ بدەتە کارێ خۆ هاریکارێ تۆمارکەری دێ بیتە تومارکەر .

د) دەمێ دەستپێکرن وبدوماهیك ئینانا دەمێ ڤەبرێ هونەری فیرکێ ئاگەهدار دکەت ودهژمێریت.

ه) ووردبینی وسەرپەرشتیا بۆردێ ئەنجامێ خالا دکەت .

## مادده -٢٧- چاڤدێرێن خیچان : ( مراقبوا الخطوط )

### بەرپرسایەتێن وان : ( المسؤولیات )

❖ چاڤدێرێن خیچان کارێن خۆ ئەنجام ددەن بکارئینانا ئالایەکێ درێژ وپانی (٤٠ ×٤٠) سم .

❖ ئاماژە دکەن بۆ بەرامبەری خۆ ئەگەر تەپە بناف یاریگەهێ بکەڤیت یان خیچا .

❖ ئاماژە دگەل بۆ دەرڤە ئالایێ خۆ بەرزدکەن ئەگەر تەپە بکەڤیتە دەرڤەی یاریگەهێ .

❖ دەستەکی دێ دانتەسەر ئالایێ خۆ ئەگەر تبلێن یان دەستێ یاریکەرەکێ بەرەڤان بتەپێ بکەڤیت وتەپە بچیتە ژدەرڤەی یاریگەهێ .

❖ ئالایی دێ بلندکەت ئەگەر تەپە بدارێ هەوای کەت لدەمێ یاریێ .

❖ ئالای دێ بلندکەت ئەگەر تەپە ژ سێرف لێدەری ژدەرڤەی دارێ هەوای بجیت کو دچیتە ژدەرڤە دناف بەرا دوو دارێن هەوایدا کو ئەوژی دبنە رێکا هاتن وچونا تەپێ.

❖ خەلەتێن پێیێ سێرف لێدەری ئەگەر لسەر خیچێ بیت ئالایێ خۆ دێ بلندکەت.

❖ ئالایێ خۆ دێ بلندکەت هەکە پێیێ هەر یاریکەرەکی ژدەرڤەی یاریگەهێ بیت (ژبلی سێرف لێدەری) . لدەمێ سێرف لێدانێ .

## مادده -٢٨- ئامازەبیێن فەرمی : ( الاشارات الرسمیة )

## ئامازێن دادڤانان بدەستی : ( إشارات الید الحکم )

دڤێت دادڤان رون کەن برێکا ئامازەکرنێن بدەستان بۆ دیارکرنا ئەگەرێ ڤیرك لێدانێ (تێدا رون بکەت چەوانیا خەلەتیێ ڤیرك بۆ لێدا یان ئەگەرێ ڕاگرتنا یاریێ) .

## پرسیار وبەرسف

پ١/ بلنداهیا تۆرێ بۆ زەلامان ٢،٤٠ م و ٢،١٤ بۆ ئافرەتان ؟

بەرسف / بلنداهیا تۆرێ بۆ زەلامان ٢،٤٣ م و ٢،٢٤ بۆ ئافرەتان ؟

پ٢/ ئەرێ بلنداهیا دارێن هەوایی لسەر تۆرێ چەندە ؟

بەرسف / دوو دارێن هەوای ٨٠ سم لسەر تۆرێ دبیت .

پ٣/ کێشا تەپا ڤۆلی بۆلێ چەندە ؟

بەرسف/ کێشا تەپا ڤۆلی بۆلێ (٢٦٠ - ٢٨٠ ) گرام .

پ٤/ ژمارا تیشێرتێن یاریکەران چەندێ تاکو چەندە ؟

بەرسف/ دڤێت ژمارێن تیشێرتێ یاریکەران ژ (١ - ٢٠) بیت .

پ٥/هەر تیمەك دوو گێما ببەت ئەو یاریێ دبەت ؟

بەرسف / هەر تیمەك سێ گێمان ببەت ئەوێ یاری بر .

پ٦/ چەند یاریکەر یاریێ دکەن وچەند گوهۆڕینێن یاسایی دبن ؟

بەرسف / (٦) یاریگەر یاریێ دکەن و (٦) گوهۆڕینێن یاسایی دبن ؟

پ٧/ هەر تیمەکێ چەند ماف هەیە لتەپێ بدەت ؟

بەرسف / هەر تیمەکێ مافێ هەی (٣) سێ جاران لتەپێ بدەت (ژبلی بلوکێ).

پ٨/ دڤێت سێرڤ دناڤبەرا چەند چرکان دا بهێتە لێدان ؟

بەرسف / دڤێت دناڤبەرا (٨) چرکان دا بهێتە لێدان.

پ٩/ هەر تیمەکێ مافێ چەند دەمێن ڤەبری هەیە دهەر گێمەکێ دا وماوێ هەر دەمەکێ ڤەبری چەندە ؟

بەرسف / هەر تیمەکێ مافێ وەرگرتنا (٢) دەمێن ڤەبری هەیە وماوەیێ دەمێ ڤەبری (٣٠) سیهـ چرکەنە .

پ١٠/ دەمێ بێهنڤەدانێ دناڤبەرا هەمی کێمان دا چەند خولەکن ؟

بەرسف / دەمێ بێهنڤەدانێ دناڤبەرا هەمی گێماندا (٣) سێ خولەکن .